پرۆفیسۆر
د.کەمال سەعدی مستەفا



# چەند وێستگەیەك

## ژیان و بیرەوەری

کوردستانی عێراق
هەولێر ٢٠١٤

* ناوی کتێب: چەند وێستگەیەک– ژیان و بیرەوەری.
* نووسەر: کەمال سەعدی مستەفا.
* بەرگ و سەرپەرشتی هونەری: عوسمان پیرداود.
* نەخشەسازی: عیسام موحسین.
* پیتچنین: نووسەر.
* چاپخانە:
* چاپی یەکەم: هەولێر ٢٠١٤
* تیراژ: ٥٠٠ دانە.
* لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی(      )ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە.

## پێشەکی:

بیرەوەرییەکانم زۆرن، بەڵام ئەوەی لێرەدا من مەبەستم بووە تەنها ئەو بیرەوەریانە بووە کە تا ڕادەیەك بایەخی کۆمەڵایەتی هەیە، یاخود زۆر گرینگە لە ژیانمدا، بۆیە هەر بە ناوی وێستگەکانی ژیانم ئەو لایەنانەی ژیانم تۆمار کردووە، هەروەها لەبەر گرینگی هەندێ ڕووداو کە ڕاستەوخۆ کەسانی پەیوەندیدا بۆیان گێڕاومەتەوە، ئەوانیشم بە پێویست زانی کە لە دوتۆی ئەم کتابەدا وەکو خۆی تۆماریان بکەم. هیوادارم سوودیان هەبێت چونکە سەرجەم ڕووداوەکانی ژیان مێژوو پێك دەهێنن، هەروەکو دەشزانین زۆرجار مێژوو دوبارە دەبێتەوە، جا بۆئەوەی سوود لە ڕابردوو و مێژووی خۆمان وەرگرین، وەك بەرپرسیارێتییێکی نەتەوەیی‌و ئەخلاقی بە ئەرکی سەرشانی خۆمم زانی گرینگترین ڕووداوەکانی مێژووی ژیانی خۆم بنووسمەوەو بیخەمە بەر دەستی خوێنەران بۆ ئەوەی لەدوای مردنم لەگەڵم نەچێتە گۆڕەوە.

**نووسەر**

**دکتۆر کەمال سەعدی مستەفا**

**٢٠١٤/٥/١٥**

**باشووری کوردستان – هەولێر**

**قۆناغی منداڵیم :**

لە گوندی ئامۆکانی سەر بە ناحیەی هەریر لە پارێزگای هەولێر لە ساڵی ١٩٥٦ لە دایك بوومە، باوکم نانەکەلییەو خەڵکی گوندی باغمرەی دەشتی هەولێرەو لە بنەماڵەیەکی مەلازادەیەو مەلا سەعیدی برای مەلای گوندی باغمرە بووەو مەلا مەحەمەدی براژاشی مەلای گوندی دارە توو بووە. باپیرم چوار ژنی دەبێت، دوا ساتەکانی ژیانی لە گوندی قۆڕپیتان بەسەر بردوو لەوێ بە خۆیو دایکی باوکم کۆچی دواییان کرد. باوکمو خوشکێکی لە ژنێکیان دەبێت لە هەمووشیان بچوکتر دەبێت، لە تەمەنی پانزە ساڵیدا باوکی دەمرێتوتەنها دایکێکی پیری دەبێت، بۆیە گوند بەجێ دەهێڵێتو دەچێتە شاری موسڵ بۆ سەربازگەی ئینگلیزەکان لە غەزلانیەو پەیوەندی بە سوپای ئینگیلیز ناسراو بە سوپای لیڤییەوە دەکاتو دەبێتە شوفێری تایبەتی کابتن ڕۆیال کە بەرپرسی هێزەکانی ئینگلیز بوو لە حەبانیەو تا نزیکەی چوار ساڵو نیو تیایدا دەمێنێتەوەو بەتەواوەتی فێری زمانی ئینگلیزی دەبێت، هەر بۆیە دوای تەواوکردنی سەربازی لە ڕێگای عبداللە سکۆدەوە لە ساڵی ١٩٥٤ لە کۆمپانیای بەنداوی بێخمە لای ئینگلیزەکان دادەمەزرێتو دەبێتە شوفێرو وەرگێڕی بەڕێوەبەری بەنداوەکەو داوای دەستی دایکم سوسن مستەفا دەکات لە لاوکەی شێخاغەی گەورەی گوندی ئامۆکانو ژیانی هاوسەرگیری پێك دەهێنن.

باوکم هەرچەندە نەخوێندەوار بوو، بەڵام کەسێکی زمانزان بوو، زمانی ئینگلیزیو عەرەبیو ئاشووریو کوردی بە تەلاقەت دەزانی، هەر بۆیە شارەزا ئینگلیزو ئەمریکیو یۆغسلافیەکان لەگەڵ هاتنیان بۆ کارکردن لە بەنداوەکانی کوردستان لە ساڵانی ١٩٥٤ تا ١٩٩٠ هەر لەگەڵ هاتنیان بۆ عێراق بەر لە دەستبەکاربوونیان لە بەنداوەکانی بێخمەو دوکانو دەربەندیخان پشتیان پێی دەبەستو لە هەموو کۆمپانیاکاندا وەك شوفێرو وەرگێڕی بەڕیوەبەری ئەو بەنداوانە کاری کردووە.

منو فارسی برام له گوندی ئامۆکان لـه دایـك بـووینو تـا تەمـەنی پێـنج ساڵی لەوێ بووم، دواتر بەهۆی گواستنەوەی ڕاژەی باوکم له بەنـداوی بێخمـه بۆ بەنداوی دەربەندیخان ماڵمان چووه ئەوێو لەوێ چوومه بەر خوێنـدنو تـا پۆلی سێیەمی سەرەتایی لەوێ خوێندم.

ئەوەی بۆ من گرینگه لەم قۆناغەدا خۆشترین یـادەوەریم ئەوەیـه کاتێـك فارس براگەورەکەم چووه قوتابخانەو بـه کۆمـەڵێك کتـابو دەفتـەرو قەڵـەمو مساحەو موختاتـه هاتـەوە، منـیش ویسـتم لەگـەڵی ببمـه شـەریك بـەڵام ئـەو هیچی لەو شـتانەی کـه وەریگرتبـوون نەیـدامیو منـیش بـه چـاوی گریانـەوە چوومه لای مام لاوکەی شێخاغه که گەورەی گوندی بوو، لای ئەو شکاتم لێـی کرد ئەویش سلێمانی کوڕی لەگـەڵ ناردمـه لای حـاجی ئەحمـەد کـه عـەتاری گونـدی بـوو ووتــی چـیت دەوێ بۆخـۆت هـەڵی بگـرە، بـەم شـێوەیه بوومـه خاوەنی کتابو دەفتەرو قەڵەم.

ئەوەی شایەنی باسه، لاوکـەی شـێخاغه تـابڵێی پیـاوێکی کوردپـەروەرو دڵو دەروون پاكو سادەو سـاکارو بەخشـندەبوو، خـەڵکی گونـدی ئامۆکـانی زۆر خۆشدەویست، باجو سەرانەی لێ وەرنەدەگرتنو به ئارەقـەی نیوچـەوانی خۆی دەژیا. مـەلا مسـتەفای بـارزانی زۆر خۆشدەویسـتو زۆربـەی ژیـانی بـه پێشمەرگایەتیو دەربەدەری بەسەر بردبوو، چەندجارێك لەترسـی بۆردومـانی فڕۆکەکانی دوژمن خۆیو کـەسو کـاری گونـدیان چـۆڵکردووه بـەڵام هـەرگیز نەسڵەماونەتەوە.

که منالێ بووم زۆرجـار دەچـوومه لای داوای دەمانچـەیەکم لێـی دەکـردو دەمووت دەبمه پێشمەرگەی تۆ. ئەویش دەیووت که گەورەبوی دەمانچەکەی خۆمـت دەدەمـێ. لـه سـاڵی ١٩٧٤ کاتێـك مـنو نـەوزاد عەسـاڤ بـرادەرم کـه بەیەکەوه چوینه دەرەوە، هەوەڵجار چوینه گوندی ئامۆکانو چـوینەلای ئـەو داوامان لێی کرد بمانکاته پێشمەرگەی خۆی. بەڵام ئەو ووتی من ئەرکی زۆرم

لێرە هەیەو ڕەنگە هەندێك دوابکەوم بۆیە باشتر وایە ئێوە خۆتان دوا نەخەنو بەیانی بەڕێبکەونو دواتر لەسەرەوە دەتانبینمەوە.

لە ساڵی ١٩٦٧ باوکم گواسترایەوە بۆ بەڕێوەبەرێتی بەنداوەکان لە شاری هەولێرو ماڵمان چووە گەڕەکی سێتاقان بەو هۆیەشەوە منیش چوومە قوتابخانەی سۆرانی سەرەتایی کە مامۆستا کەمال شاکر بەڕێوەبەری بوو. لەم قوتابخانەیە زۆر شتی باش فێربووم بەتایبەتی وێنەکێشان لەسەر دەستی مامۆستا چەتۆ حەسەنو هۆنراوە دانان لەسەر دەستی مامۆستا عومەر شێخەللا دەشتەکی، کە ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە پێگەیاندنو پەروەردەکردنی ئێمە، داوای لێ دەکردین کە هۆنراوەو پەخشان دابنێینو پەندی پێشینانو ئەفسانەو داستانو چیرۆکی بەرئاگردانیشی بۆ کۆبکەینەوە، لەبری ئەم چالاکیانە نمرەی دەداینێ هەروەها سالانەش خەلاتی بۆ دەرچووە یەکەمەکانی زمانو ئەدەبی کوردی تەرخان دەکرد.

مامۆستا عومەر شێخەللا دەشتەکی وای لێ کردبووین کە زۆر باوەڕمان بە خۆمان بێتو هەرزوو خۆمان لە قەرەی ئەدەبی کوردی بە تایبەتی شیعرو پەخشان بدەین، بۆیە هەر لە ساڵی ١٩٦٧ یەکەم هۆنراوەم کە هۆنیەوە پێشکەشی بەڕێزیانم کردو هەر لەو ساتەوە لە سۆراغیم نەپرسیەوەو نەمزانی چی لێهات تا ساڵی ١٩٩٠ کاتێك کۆمەڵە چیرۆکێکم بەناوی (دەرگا) بە چاپ گەیاندو وەك دیارییەکی زۆر بچوكو هێمایەکی خۆشەویستی لە لاپەڕەی بەراییدا پێشکەشی مامۆستا عومەر شێخەللام کردبووو دانەیەکم بە دیاری دایە، سوپاسی کردمو پێی ووتم ئەمانەتێکت لام ماوە حەزدەکەم هەتا نەمردوومە بۆتی بگەڕێنمەوە کە بریتیە لە پارچە هۆنراوەیەکت کە لە پۆلی چوارەمی سەرەتایی لە ساڵی ١٩٦٧ داتناوە.

ئەم پیاوە مەزنە نزیکەی (٢٣) ساڵ یەکەم هەوڵە هۆنراوەی منی لەناو کتێبخانەکەی خۆی پاراستووە کە من نەك هەولێکی وا بەلکو لەو ماوەیەدا دەیان هۆنراوەی باشی خۆمم لە دەست داوەو بەبێ بایەخ فڕێم داوە.

لـه هەمووشــی گـرینگتر فێـری کوردایـەتی بـووم لەســەر دەسـتی ئـەو مامۆستا گەورەو نەمرە،بەوەی کە دەهاتە پـۆل بـەر لـە سـڵاوکردن بـە دێـڕە شیعرێکی حاجی قادری کۆیی دەسـتی پـێ دەکـردوو دەیـووت: هـەر کـوردێ قسەی بابی نەزانێ موحەقەق داکی حیزە بابی زانی، یان دەیووت: کوردێ لـە کوردێ حەزنـەکا مـەڵێ چـیە وەیـا چـۆنە ... لـە دایکـی پرسـیاربکە کـە ئـەو بێچوەی لە کوێ هێنا.

مامۆستای خوالێخۆشبوو نـاوی لـەمن نـابوو پـارێزەرو بەرلـەوەی سـزای ئەو قوتابیانە بدات کە چاودێری پۆل لەسەر تەختەی ڕەش ناوی نووسـیبوون منی دەهێنا دەرەوەو دەیووت پارێزەر تۆ حوکم بدە کێ لەوانە موستەحەقی سزایە یان نا. بەم شێوەیە ڕۆژانە ئـەم سـیناریۆیە دووبـارە دەبـۆوەو منـیش هەمیشە قسەی هەقم دەکرد، تەنانەت جارێکیان چـاودێری پـۆل سـعاد فتـاح بوو ووتم بە ناهەق نـاوی ئـەو قوتابیـەی نووسـیوە بۆیـە دەبـێ دارەکـان لـەو بدرێ.

## قۆناغی گەنجێتیم :

لە ساڵانی ١٩٧٠ – ١٩٧٣ خوێندنی ناوەندیم لە قوتابخانەی کۆماریو قوتابخانەی سەیداوە تەواو کرد. پۆلی یەکەمم لە قوتابخانەی کۆماری تەواو کردو پۆلی دووەمیشم تا نیوەی ساڵ لەوێ خوێند و دواتر چوومە قوتابخانەی سەیداوە و لەوێ خوێندنی ناوەندیم تەواو کرد.

لەم قۆناغەدا لەسەر دەستی مامۆستای خوالێخۆشبوو ئەکرەم عەلافو مامۆستا ئەحمەد جەزائیری پەرەم بە هونەری نیگارکێشان دا، هەروەها بەهرەی نواندنم لا دروست بوو، بە تایبەتی لە قوتابخانەی ناوەندی سەیداوە لەسەر دەستی قوتابی بەهرەمەندخوالێخۆشبوو عبدالستار عبدالله یوسف برای شاعیری نوێخواز عباس عبدالله یوسف مرۆڤێکی زۆر بەخشندەو خۆنەویست بوو هەر بە گەنجی بە نەخۆشیەکی کوشندە کۆچی دوایی کرد بەڵام تاك و ئێستاش لە دڵ و دەروونم هەر زیندووە.

گرینگی ئەم قۆناغە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە تا ڕادەیەك کەسایەتیم تەکوین ببوو، بۆیە هەوڵم ئەدا لە هەموو شتێك هەڵوێستی خۆمم هەبێتو خاوەنی بڕیاری سەربەخۆی خۆم بم. لە ساڵانی ١٩٧٠ – ١٩٧٦زۆربەی کاتەکانم لە ژووری نیگارکێشان بەسەر دەبردوو لەسەر دەستی مامۆستا مستەفا شەوکەت پەرەم بە توانا هونەرییەکانی خۆم لە نیگارکێشان دا، هەروەها بە سەرپەرشتی مامۆستای زمانو ئەدەبی کوردی خوالێخۆشبوو ئەمینە فەندی کۆمەڵێك بڵاوکراوەی سەر دیوارو دواتریش بە هەماهەنگی پۆلێك قوتابی لەوانە ئەبوبەکر خۆشناوو سابیر ڕەشیدو مەوجود سامانو مەسعود پەرێشانو هەندێکی ترلە ساڵی ١٩٧٥ لە ئامادەیی کوردستان گۆڤاری ((کاروان)) مان دەرهێناو کۆمەڵێك بابەتی ئەدەبمان تیا بڵاوکردەوە. هەر لەو ساڵەداو لە یادی دامەزراندنی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە ١٨/ شوباتدا لە سەر شانۆی ئامادەیی کوردستان مەنەلۆجی (ئەی قوتابی ئەی

قوتابی ... خوێندن بەو حاڵەی قەت نابی )م ووت کە تێکست و ئاوەزەکەی هی خۆم بوو، سابیر ڕەشیدو مەسعود پەرێشانو سەربازجاف کۆرس بوونو لە دوای من دەیانووتەوە.

لە ڕێکەوتی ١٩٧٣/١٠/١ پەیوەندیم کرد بە کۆمەڵی هونەرو وێژەی کوردیەوەو بوومە ئەندام لە بەشی شانۆ. برایانی شاعیر فەرید زامدارو جەوهەر کرمانجو سەعدوڵلا پەرۆشو هونەرمەند سابیر عبدالرحمن لەوێ ناسی. دەمەتەقێیەکم لە شێوەی دەمەتەقێی جقو نق نووسیبۆوەو پیشانی فەرید زامدارو سەعدوڵلا پەرۆشم دا، سەرەڕای لاوازیی بابەتەکەم کەچی نەیانشکاندمەوەو دەسخۆشیان لێکردمو بە زمانێکی دبلۆماسیانە تێیان گەیاندم کە زیاتر بخوێنمەوە. جا لەو کاتەوە بوومە دۆستی کتێبو ڕۆژنامەو گۆڤارەکان بەتایبەتی ڕۆژنامەی برایەتیو گۆڤاری بەیانو ڕۆشنبیری نوێ. لەو ماوەیەداو تا ساڵی ١٩٧٩ بەشداریم کرد لە هەندێك نواندنی تەلەفزیۆنیو ئۆپەرێتو شانۆگەریدا، لەوانە شانۆگەری (زاوایەکی گەلحۆ) لە نووسینو دەرهێنانی عبدالواحد مەرجان کە ڕۆڵی جەندرمەم تیایدا بینیو لە ماوەی نێوان ٢٠–١٩٧٣/٣/٢٣ لە هۆڵی گەل نمایشکرا، هەروەهاتەمسیلی (هەڵەی دەرهێنەر) کە لە تەلەفزیۆنی بەغدا لە ڕێکەوتی ١٩٧٥/٤/١١تۆمارو پەخشکرا لە نووسینی محەمەد سدیق محمودودەرهێنانی عماد بهجت ڕۆڵی چایەچیم تیایدا بینی، هەروەها (ئۆپەرێتی باران) لە نووسینو دەرهێنانی هونەرمەند عبدالواحید مەرجانو ڕۆڵی جوتیارم تیایدا بینی، لە فیستەفاڵی ڕۆشنبیری کوردی لە هۆڵی خولد لە بەغدا لە ١٩٧٤/٢/٢٧نمایش کرا، هەروەها وەك کۆرس لە هەمان فستەفاڵدا بەشداریم کرد لەگەڵ هونەرمەند فوئاد ئەحمەدو یحیا مەرجانو محەمەد جەزاو مامۆستا خێروڵلا.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، فیستەفاڵی ڕۆشنبیری کوردی کە ماوەکەی یەك حەفتە بوو، بەرنامەکەی پێشتر ئامادەکرابوو، بەسەرپەرشتی وەزیری

ڕاگەیاندنی عێراق بەڕێوە دەچوو. هونەرمەندی میللی کورد مەکی عبدوللاّ ناسراو بە عەلیەفەندی هەر لەناو هۆڵەکە بیرۆکەی کاریکاتێرێکی لا دروست بوو، بۆیە داوای لە وەزیری ڕاگەیاندن کرد کە بڕگەیەکی پانزە دەقیقەیی بۆ تەرخان بکرێت تا کاریکاتێرەکەی تیا نمایش بکات. دوای ڕاوێژکردن لەگەڵ دکتۆر ئیحسان فوئاد کە بەڕێوەبەری گشتی ڕۆشنبیری کوردی بوو، ئەو بڕگەیان بۆی خستە دوای حەیرانێکی هونەرمەند ڕەسوول گەردی. جا لە هەمووی سەیرتر ئەوەبوو پێمانووت کوا کاریکاتێرەکە ئامادەکراوە؟ ووتی جا ئامادەکردن چیە هەتا ڕەسول گەردی لە حەیرانەکەی دەبێتەوە من ئامادەی دەکەم.

ڕاستی کرد، هێشتان ڕەسول گەردی لە حەیرانەکەی نەبووبۆوە، کە عەلیەفەندی لە دەرهێنانی کاریکاتێرەکەی ببۆوەو لە تەنیشت پەردەکەوە ئاگاداری ڕەسول گەردی دەکردەوە کە کۆتایی بە حەیرانەکەی بهێنیّو بواری ئەو بدات. ڕەسول گەردیش لەبەر چەپڵە لێدانی ئامادەبوانو سەرسووڕمانی وەزیری ڕاگەیاندن هێندەی تر بەگوڕیان هێنابوو.

عەلیەفەندی بۆئەوەی ئەو کاتەی بۆی داندراوە لە دەستی نەچێت، ناچاربوو پەردە لەسەر ڕەسول گەردی دابخات. جا سەیرەکە لەوەدابوو وورده وورده هەردوولای پەردەکە لەیەك نزیك دەبۆوە بەلاّم ڕەسول گەردی هیچ خۆی نەدەشێواندو بەردەوام بوو لە حەیران ووتن تا بەتەواوی پەردەکە بەروویدا داخرا، تەنانەت ئەوکاتیش سەری لە نێوان پەردەکە دەرهێنابوو بە دەنگی بەرز دەیووت ئەوجا دەرێم حەیران..... بەلاّم عەلیەفەندی لە پشتەوە پشتێنەکەی ڕاکێشاو نوقەی لیّ بڕی.

هەروەها بەشداریم کردووە لە شانۆگەری کاوەی ئاسنگەر لە نووسینو دەرهێنانی (هونەرمەن عبدالواحید مەرجان )کە لە هۆڵی خولد لە بەغدا لە ساڵی ١٩٧٥ نمایش کراو ڕۆڵی کوڕی کاوەم تیا بینی.

شـــايەنی ئاماژەبۆکردنە،کـــە بەڕێکـــەوتین بـــۆ نمـــایش کردنـــی ئـــەو شانۆگەرییە، لە خاڵی پشکنینی بەغدا لەکاتی پشکنینی جانتاکانمان پیاوانی ئاسایشـی بنکەکـە خەنجـەرێکی گـەورەیان لـە نـاو جانتاکـەی هونەرمەنـدی خوالێخۆشبوو فتح الله عمر خۆشناو دەرهێنا کە بۆ دەوری کـاوەی ئاسـنگەر لەگەڵ خـۆی هێنـابووی بـۆ کوشـتنی زوحـاك، بـە توڕەییـەوە ئێمـەیان بـردە لایەکی شەقامەکەو ووتیان نازانن چەكو سیلاح قەدەغەیـەو ئـەوە دەتانـەوێ کێی پـێ بکوژن؟ مام فەتحوللاش یادی بەخێر بە پێکەنینەوە ووتـی هێناومـە زوحـاکی پـێ بکـوژم. ئەفسـەرەکە نـەیزانی مەبەسـتی چـیە، هـەروای زانـی کەسـێکی دیـاریکراوە بۆیـە هـەمووانی هێنـا خـوارەوەو پەیوەنـدی بـە دەسەلاتی سەرەوەی خۆی کردو ووتی هەندێ کەسی گومـانلێکراوم گرتـووە. بـەکورتی ئیشـەکە گـەورەبوو بۆیـە ئێمـە لـەو سـەینو بەینـەدابووین هاشـم عـەقراوی کـە سـەرۆکی ئەنجومـەنی ڕاپەڕانـدنی کوردسـتانو سـەرۆکی وەفدەکەشمان بـوو بـۆ بەغـدا بـە ئۆتۆمۆبیلەکـەی گـەڕاوە لامـانو تەلـەفۆنی لەگەڵ وەزیری ڕاگەیاندنی عێراق کردو بە درێـژی تێـی گەیانـد ئەوسـا لەسـەر ڕاسپاردەی وەزیر ڕێگایاندا بڕۆین.

لە بـەهاری سـاڵی١٩٧٤ دوای ئـەوەی ڕێککـەوتنی حکومـەتی ناوەنـدیو شۆڕشی کورد گەیشتە بنبەست، لەگەڵ قوتابی خوالێخۆشبوو نەوزاد عەساف چوومە سەرەوەو پەیوەندیمان بـە شـۆڕش کـردو دواتـر لـە نـاوپردان لەسـەر دەستی هونەرمەندی دەرهێنەر زوهێر عبدالمسیح لە تیپـی نوانـدنی ئیسـگەی دەنگی کوردستان لەگەڵ چەند هونەرمەنـدێك وەك ئەکتـەر وەرگـیرام، لەوانـە هونەرمەنـد شـێرزاد ڕەنجـەڕۆو هونەرمەنـدی خوالێخۆشـبوو سـوبحی کـۆییو ....هتد.

هەرچەندە لەو ماوەیەی لە ئێزگە دامەزرام تا ئەو کاتەی گەڕامەوە هـیچ چـالاکییەکی هونـەریم نـەبوو، بـەلام دووجـاران ڕووبـەڕووی مەترسـی مـەرگ

بوومەوە. جارێکیان لە چێشتخانەکەی دەروازەی گەلاڵە بووم کە فڕۆکەکانی حکومەت ئەو ناوەیان بۆردومانکرد، ئەگەر ڕام نەکردباو خۆم لە بنار بەرزاییەکانی بەرامبەری حەشار نەدابا، منیش چارەنووسم لە قوربانیەکانی چێشتخانەکە باشتر نەدەبوو، کە خاوەنی چێشتخانەکەو دەیان کەس شەهید بوون. جارێکی تریش لەگەڵ ستافی تیپەکەمان بە نیازی سەردانی ماوەت، بۆ کردنەوەی ستۆدیۆیەکی هونەری لەو دەڤەرە بە ڕێگای ڕانیەو قەلآدزێ بەڕێ کەوتین، منو چەند برادەرێك لە ستافەکە لە مزگەوتی گەورەی ڕانیە لەسەر ئاوی قولە بۆ پشوێك خۆمان دواخستو دواتر کە گەیشتینە قەلآدزێ، بەسەر بۆردومانەکەیدا چوین، ڕووداوێکی دڵتەزێن بوو، کەسانێکی زۆر گەورەو بچووك لە نێوان شەهیدو بریندار بووندا ببونە قوربانیو تەنانەت هەندێ لە برادەرانی ئێمەش لە ستافی تیپەکەمان بریندار ببون، لەوانە شێرزاد ڕەنجەڕۆ لەگەڵ بارودی ناپاڵمەکان ڕەش هەڵگەڕابوو.

دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە چوار مانگ کە هیچ هەواڵێکی خانەوادەکەمم نەبوو، زۆر یادم دەکردن بۆیە چومە لای خوالێخۆشبوو مامۆستا دارا تۆفیق کە ئەمینداری ڕاگەیاندن بوو داواکارییەکم پێشکەشکردوو تیایدا داوای یەك حەفتە ئیجازەم کرد بە مەبەستی سەردانی دایكو باوکم، بەڵام بەڕێزیان ووتی کوڕم یەك حەفتە بەشی چوونو هاتنەوەت ناکات، بۆیە بۆی کردم بە سێ حەفتە.

بۆ ئەم مەبەستە بەڕێگای مێرگەسۆرو گۆڕەتوو دواتر شانەدەرو گوندی بیکێ بەڕێکەوتم. لە ڕاستیدا بۆیە ئەو ڕێگایەم هەڵبژارد چونکەماڵی پلکێکم کە خوشکی دایکمە لەو گوندە بوون حەزمکرد سەردانێکی ئەوانیش بکەم دواتریش هەر بە دەم زێی گەورە واتە زێی بێخمە بەرەو هەولێر بگەڕێمەوە.

شەوێك لەوێ مامەوەو دەبابەکانی سوپا لەسپیلکەوە بۆ بەیانی ئەو گوندەیان بۆردومان کرد بەڵام خۆشبەختی هەمووومان سەلامەت دەرچووینو هیچ زیانی ماددی نەبوو. بەیانی بەڕێکەوتمو بۆمن ئەو گەشتە زۆر دوورو

درێژو ترسناك بوو ، بەڵام قۆناغ بە قۆناغ هەر بە پێ ڕۆیشتمو شەوانیش بگەیشتمایەتە هەر گوندێك لێی دەماوە. بەهەرحاڵ، دوای چەند شەوورۆژێك گەیشتمە گوندێکی زرارەتی لە دەم زێ ئێستا ناوەکەیم لەبیر نەماوە، لەدەم زێی گەورە لەژێر سێبەری دار توێك لێی ڕاکشابووم، کاتێك زانیم کوڕێکی گەنج کەناوی شەفیق بوو بانگی کردمو خۆی پێ ناساندمو وتی بە جلو بەرگەکانتەوە دەزانم کە تۆ پێشمەرگەیت، چیدەکەیتو بۆ کوێ دەچی، پێم بڵێ مەترسە، ئەم گوندە گوندی جاشانە، بەڵام من یارمەتیت دەدەم باوەڕم پێ بکە. منیش نەمتوانی بیشارمەوە کە پێشمەرگەم چونکە جلێکی کوردی خاکی تریکۆی بە کەتافیەم لەبەر بوو لەگەڵ لاپچینێکی شەوڕۆ کە نیشانەی پێشمەرگایەتی بوون، بۆیە بڕوام پێی کردوو ڕاستیەکەم پێی ووتو ئەویش زۆر بە گەرمیەوە دەستی گرتمو منی لەگەڵ خۆی بردە ماڵەوەو ووتی ئەمشەو لای ئێمە بخەوەو بەیانی لەگەڵ کەسێك ڕەوانەت دەکەم ناوی مەجیدەو جێبێکی هەیەو لەو خەتە ئیش دەکات، لە ژێرەوە لەگەڵ پێشمەرگەیە ڕایدەسپێرم هەتا ناو شاری هەولێر بتباتو زۆر ئاگای لێت بێت. جا ئەوبوو بەیانی نانمان خواردو بەڵێنەکەی خۆی هێنایەدیو منی تەسلیمی شوفێری ناوبراو کردو لەپشتەوەی جێبەکە لەگەڵ هەندێ نەفەری تر دانیشتمو لە ترسانیش دڵم هەر کوتە کوتی بوو، کاکی شوفێر بەلاڕێدا دەڕۆیشتو بەناو ئەو خۆڵو بەردەدا لە ناکاوێکدا کەوتینە ناو هێرشێکی سەربازو جاشەکانی حکومەت بۆسەر پێشمەرگەکانی هەمزە سێوێ بەڵام هەرزوو پێشمەرگەکان هێزەکانی حکومەتیان تێکشکاندو ناچاریانکرد بکشێنەوەو ئێمەش ڕێگای خۆمانمان گۆڕیو کاتێك ئەوەندەم زانی لە نزیك گەڕەکی بەستەپیازەو لە تەنیشت کارگەی مافووری شاری هەولێر لەسەر شەقامی شەست مەتریخۆمان بینیەوە. لەوێشەوە بەپێ بە ئاراستەی مزگەوتی سپی ڕۆیشتمو دوای پشوێك هەر بەپێ بەرەو ماڵەوەمان لە گەڕەکی

موفتی ڕۆیشتمو بۆ پێش نیوەڕۆ گەیشتمەماڵەوە. کە چووومە ژوورەوە دایك باوکم بە دیتنی من سەرسام بوون. دوای ماچوومۆچ فارسی برام زۆر دڵخۆشبوو بە بینینی منو داوای لێکردم بە درێژی باسی هەموو شتێکی بۆ بکەم هەر لە یەکەم ڕۆژی چونە دەرەوەم تا گەڕانەوەم، ئەوەبوو منیش ڕووداوەکانی ئەو چوارپێنج مانگەم هەمووی بۆی گێڕایەوە کە بە هەقیقەت گەشتێکی مێژوویی‌و ئەفسانەیی بوو لە ڕووی مەعاناتی زۆرەوە کە بە چەند کتابێك باسکردنی کۆتایی نایەت.

شایەنی باسە، باوکم بە حوکمی ئەوەی کارمەندی میری بوو، هەروەها پیاوێکی بێ دەخل بە درێژایی ژیانی، بۆیە زۆر دەترساو ڕقیشی زۆر لە سیاسەت دەبۆوە، بۆیە هەر بۆ بەیانیەکەی دەستی گرتمو بەزۆر لەگەڵ خۆی منی بردە ماڵی حسێن ئاغای سەرچا کە وێرای ئەوەی خزمی دایکم بوو بەلاَم برادەرێکی زۆر نزیکی باوکیشم بوو بە حوکمی ئەوەی باوکم لە سەردەمی کارکردنی لە بەنداوی بێخمە لە ساڵانی پەنجاکاندا دۆستایەتی لەگەڵ خدراغای باوکی هەبوو، بۆیە داوای لێکرد کە چارەسەرێکمان بۆ بدۆزێتەوە تا نەگەڕێمەوە. ئەوەبوو زۆر ئامۆژگاری کردمو ووتی خوارزا بۆتۆ باشترە خوێندنەکەت تەواو بکەیت نەوەك لەم شاخو داخە خۆت بە کوشتن بدەیتو دڵی باوكو دایکیشت بڕەنجێنیت. لە ڕاستیدا قسەکانی ئەو هیچ کاری تێنەکردم بەلاَم تازە کار لەکار ترازابوو، لەبەر دڵی باوکم لە مانەوە بەو لاوە هیچ بژاردەیەکی ترم نەبوو بۆیە زۆر خەمبارو دڵتەنگ بوومو هیچ قسەم نەکردو ئەویش تەلەفۆنی لەگەڵ بەڕێوەبەری ئەمنی هەولێری ئەوکات کرد (مەبەستم کۆتاییەکانی مانگی تەموزی ساڵی ١٩٧٤) و پێی ووت خوارزایەکم قوتابیەو ماوەیەك لە گوندی بێکێ لە ماڵی پلکی گیری خواردووەو نەیتوانیوە بگەڕێتەوە، ئێستا هاتۆتەوە دەمەوێ بیبەخشنو وابکەن خوێندنەکەی نەفەوتێ. کە تەلەفۆنەکەی داخستەوە بە باوکمی ووت لەگەڵ خۆت بیبە بۆ

ئەویٚ ئازاری نادەن بەلاّم هەر دەبیٚ نووسراویٚکی بۆ بکەن تا ڕیٚگەی پیٚ بدریٚ لە قوتابخانە وەربگیریٚتەوە. ئەوەبوو چووین بۆ ئەویٚ بەلاّم نەیانهیٚشت باوکم بیٚتە ژوورەوە تەنها منیان بردە لای مودیری ئەمنو دوای دەیان پرسیارو وەلاّم کە هەر هەموویانم ڕەتکردەوە کە هیچ پەیوەندییٚکم بە شۆڕشەوە نەبووەو تەنها لەلای مالّی پلکم بوومە، زۆر لیٚم تووڕەبوو، بە تووڕەییەوە زۆر جویٚنی پیسی پیٚدام ووتی وا دەزانی ئیٚمە هیچ نازانین درۆمان لەگەلٚ دەکەیت، ئاماژەی بە ناوی کەسیٚکدا کە پیٚشتر بەیەکەوە چوبووینە سەرەو ئەو پیٚش من خۆی دابوو بە دەستەوە، وەك بەلّگەیەك کە من ئیفادەکانم نادروستن. بەلاّم پشت ئەستوور بووم بە حسین ئاغاو هەروەکو ڕاشیسپاردبووم کە لەو دوو قسەیەی کە کردم زیاتر هیچیتر نەلّیٚم، بۆیە سووربووم لەسەر قسەکانم شتی زیاترم نەووت.

هەر لەو کاتەدا، ناردی مریشکیٚکی برژاویان هیٚناو لەبەر دەممی داناو ووتی ئەمە بخۆ؟ واپیٚدەچیٚت زۆرت برسی بیٚتو گۆشتت نەخواردبیٚت. منیش ووتم هیچ برسیم نیەو پیٚم ناخوریٚ.

کە ئەمەم ووت بە تووڕەییەوە ووتی دەبیٚ بیخۆی. منیش سووربووم لەسەر نەخواردنی. هەر لەو کاتەدا یەکیٚك لەو ئەفسەرانەی کە لە بەرامبەرم دانیشتبوو، کلاشینکۆفەکەی دەستدایەو قۆنداغەکەی بە توندی بۆ لای دەموچاوم ڕاوەشاند. ئەگەر سەرم نزم نەکردبایە، سەری دەپەڕاندم هیٚندە بەهیٚزبوو.

بەهەرحالٚ، بەڕیٚوەبەری ئەمن نووسراویٚکی پیٚدام بۆ قوتابخانەکەم (ئامادەیی کوردستان)و بۆڕۆژی دواتر لەگەلٚ باوکم بردمانە لای مامۆستا مدحت محەمەد سەفوەت خوالیٚی خۆشبیٚت زۆر بەڕیٚزەوە لیٚی وەرگرتینو پیٚی ووتم کوڕم بۆئەوەی ئەم سالّت نەفەوتیٚ بخویٚنەو لە خولی دووەم بەشداری ئەزموونەکان بکە منیش بە مامۆستاکان دەلّم یارمەتیت بدەنو خۆشم لە نزیکەوە چاوم لیٚت دەبیٚت.

هەتا دەمرم ئەو چاکەیەم لەبیرناچێت، بەشداری خولی دووەمم کردو بە هەقیقەت بە یارمەتی ئەو بەڕێزە لە قۆناغی چواری ئامادەییەوە چوومە پۆلی پێنجەم.

لە ساڵی ١٩٧٣ ماڵمان چووە گەڕەکی موفتیو لەوێ جێگیر بووین. هاوینان ئێمەو گەنجانی گەڕەك لە کارگەی کاشی گەلاڵە کە لە تەنیشت بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی هەولێر بوو، مامی برادەرێکمان کە ناوی عبد بوو مامی نەوزاد عەساف ی برادەرمان بوو لەوێ ئیشی پێ دەکردین. هەروەها هەندێ جاریش منو فارسی برام لەگەڵ وەستا عەلی باداوەیی کە دراوسێمان بوو ئیشی کرێکاری پێ دەکردین.

لە ساڵی ١٩٧٦ بۆ تەواوکردنی خوێندن لە پۆلی شەشەمی ئەدەبی چومە ئامادەیی هەولێری شەوانو لە ئەمینداریێتی شارەوانیو هاوینەهەوارەکان لەگەڵ ئازاد عبدالواحید کۆیی دامەزراینو بەمەش لە کەمدەرامەتی ڕزگارم بوو.

هەر لەو سالآنەدا دەستم بە نووسین کردو بۆ ئەم مەبەستە لەگەڵ شێرزاد عبدالرحمنو ئازاد عبدالواحیدو ئەبوبکر خۆشناو ناوە ناوە سەردانی شاری بەغدامان دەکردو بابەتی ئەدەبیمان بۆ ڕۆژنامەی هاوکاریو گۆڤاری بەیانو ڕۆشنبیری نوێ دەبرد هەر لەوێ لەتیف هەڵمەتو مەحمود زامدارو ئەحلام مەنسورو بورهان قانیعو دەیان ئەدیبی ترم ناسی.

لەشاری هەولێریش ئاشنایەتیمان لەگەڵ مامۆستا ئەمجەد پەیداکرد ئەوکاتە بەڕێوەبەری مەرکەزی شەباب بوو ئێمەی ئەدیبو نووسەرە لاوەکان لەوانە سابیر ڕەشیدو مەسعود پەرێشانو ابوبکر محمد علی ناسراو بە بەکر زەندی شێرزاد عبدالرحمانو حەیدەر عبدالرحمانو ئازاد عبدالواحیدو ڕێواس جافو چیمەن کاوێسو چەندانی تر لە دەوری کۆببوینەوەو ئیوارە کۆڕی بۆ ڕێك دەخستینو ئێمەش شیعرو چیرۆکی نەتەوەییمان دەخوێندەوە.

ئەم قۆناغە بۆمن پڕ بەرهەم بوو، یەکەمین پیشانگای شێوەکاریم لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٧٦ لە هۆڵی قوتابخانەی ئەیوبیە کردەوەو دواتریش چەندین پیشانگای تایبەتی ترم کردەوەو لە دەیان پیشانگای هاوبەشیش بەشدار بووم‌و کۆمەڵێك دیاری‌و مەدالیاو بڕوانامەی ڕێزلێنانم وەرگرت، هەروەها دوو پیشانگای نیگارکێشانم بۆ منداڵانی شاری هەولێر کردەوە.

هەر لەو ماوەیەدا لەگەڵ زیاد مامەند حەمەد مەندۆ کە دراوسێمان بوو، ئێواران سەردانی مامۆستا گیوی موکریانیمان دەکرد لە چاپخانەکەی چاپخانەی کوردستان.باسی ئەدەب‌و ئەدیبانمان لێی دەپرسی. مرۆڤێکی کوردپەروەرو سادەوساکار بوو، زۆر بایەخی بە لاوان دەدا، هیچ بیرەوەرییێکی لێ نەدەشاردینەوەو سەرگوزشتەی زۆربەی ئەدیب‌و نووسەرو شاعیرە کۆچکردووەکانی سەردەمی خۆی بۆ دەگێڕاینەوە.

جارێکیان باسی گۆرانی شاعیری بۆ کردین‌و ووتی بە بۆنەی نەورۆز فایەق بێکەس بە دوایدا ناردم کە بە خۆم‌و کامێراکەمەوە بچمە شاری سلێمانی تاکو وێنەی ئەو کۆڕە شیعرییە بگرم کە لەلایەن بێکەس‌و گۆران‌و پیرە مێردەوە بەو بۆنەیەوە لەسەر چیای گۆیژە سازیان دەدا.

هەر لە درێژەی قسەکانیدا ووتی خۆم‌و کامێراکەم چووم بەڵام پێش ئەوەی کۆڕەکە دەستپێبکات فایەق بێکەس ووتی پیرە مێرد جلکی کوردی لەبەردایە بۆیە هیچ کێشەی نیە بەڵام دەبێ جلکە کوردییەکەی خۆت دابکەنی‌و بیدەی بە من‌و گۆران تا لەکاتی شیعر خوێندنەوەدا بیپۆشین‌و وێنەیەکیشی پێ بگرین. ئەوەبوو بێکەس جل‌و بەرگی منی لەبەرکردو وێنەیەکم بۆی کێشا، بەڵام کە نۆرەی گۆران هات ڕەفزی کردو ووتی ئەم جل‌وبەرگە هی کەرەو لەبەری ناکەم. فایەق بێکەسیش تا هێزی لەبەردابوو بۆکسێکی پیادا کێشاو ووتی ئەم جل‌و بەرگە هی نەتەوەی کوردە دیارە تۆ زۆڵی بۆیە بە نەتەوەی خۆت شەرمە، ئەگەر لەبەری نەکەیت لێناگەڕێم شیعرمان لەگەڵ بخوێنیتەوە. ئاگری نەورۆزیان کردەوەو پیرەمێردی نەمریش

دەنگی خۆی خستە پاڵ ئەوو لێنەگەڕان شیعر بخوێنێتەوە تا جلکی کوردی لەبەرنەکرد.

شایەنی باسە، مامۆستا گیوی موکریانی یەکەم وێنەگری ڕۆژە (مصور شمسی) لە شاری هەولێرو هەروەکو خۆی ووتەنی ئەم کارەی کردۆتە پیشە بۆ پاڵپشتی چاپخانەکەی، چونکە ئەوکاتە زیانی لە قازانجی زیاتر بووەو لەبەر چاپکردنی کتێبی کوردی بەشی گوزەرانو ژیانی ئەوی پێ دابین نەکراوەو ناچاربووە بۆ ژیانی خۆی پشت بە کامێرا بۆکسەکەی ببەستێت. زۆرجاران پێی دەووتم نەمردبام بم دیتبا کۆڕی زانیاری کورد فەرهەنگی نۆبەرەی بۆ چاپ کردبام. منیش دەمووت باشە مامۆستا ئەی ئەوە نیە تۆ خۆت چاپخانەت هەیەو بەردەوام کتێب چاپ دەکەیت، بۆچی ئەمەش لای خۆت چاپ ناکەیتو چاوت لە کۆڕی زانیاری کوردە؟ دەیووت ڕۆڵە ئەم فەرهەنگەی من زۆر گەورەیەو بەم چاپخانەیە چاپ ناکرێ هەروەها ئەگەر ئەمە چاپ بکەم نابێ بەرهەمی هیچ شاعیرێکی کورد چاپ بکەم، منیش نامەوێ دەست لەم خزمەتە هەڵگرم بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆم.

مامۆستا گیوی کوردپەروەرێکی لە ڕادەبەدەر بوو، هەربۆیە زۆرجاران بەوە تاوانبار دەکرا کە گوایە دەسکاری دەسنووسەکۆنەکان دەکاتو ووشە عەرەبیەکانی دەکاتە کوردی. ڕەنگە ئەمە تا ڕادەیەك ڕاست بێت، چونکە بە هەقیقەت مام گیوی زۆر ڕقی لە عەرەب دەبۆوە، بۆیە کەمنو زیاد مەندۆ دەچوینە لایو دەمانووت سەلامو عەلەیکم گیوی پێی ناڕەحەت دەبوو دەیووت مەڵێن سەلاموعەلەیکم بڵێن بەیانیتان باش.

ڕۆژێکیان تەماشای جامخانەی چاپخانەکەیمان کرد، بانگەوازێکی هەڵواسیبوو تیایدا نووسیبووی شاگردێکمان پێویستە. زیادمەندۆش بە منی ووت من شەرم دەکەم بەڵکو تۆ بە مامۆستا گیوی بڵێی دامبمەزرێنێ.منیش بە مامۆستا گیویم ووت ئەویش قسەکەمی ڕەتنەکردەوەو لای خۆی

دایمەزراندو ووتی هاوکاری شێرزاد فەقێو فەیسەڵ عارەب بڵبّاس بکە لە کارەکانیاندا.

چەند ڕۆژێك زیاد مەندۆ ئیشو کاری کرد، ڕۆژێکیان پێی ووتم من شەرم دەکەم بە مامۆستا گیوی بڵێم ڕۆژانەکەم چەندەو ئەویش تاکو ئێستا هیچ ڕۆژانەی نەداومەتێ. منیش بە مامگیویم ووت مامۆستا زیادمەندۆ دەڵێ ڕۆژانەکەم چەندە؟

گیوی پێکەنیو بانگی زیادمەندۆی کردو بە نەرمی گوێی باداو ووتی کورم ئەدی هەموو ڕۆژێك نانو ماستاومان لەگەڵ ناخۆیت؟ ئێمە هەر هەموومان بەبێ ڕۆژانە لەم چاپخانەیە کاردەکەین بۆ خزمەتی کوردو کوردستان.

لە ڕاستیدا زیاد مەندۆ هیچ دەنگی نەکرد، بەڵام لەو ڕۆژە بەدواوە هیچیتر نەچۆوە چاپخانەی کوردستان.

### قۆناغەکانی دواتر:

لەم قۆناغەدا باس لە گرینگترین وێسگەکانی ژیانم دەکەم لە ماوەی نێوان ساڵی ١٩٧٧ تاکو ئێستا. لەم ساڵەدا دوای هەوڵو تەقەلایەکی زۆر لە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدا بەشی تەشکیلی وەرگیرام، لە ڕاستیدا بۆمن ئەوە خەونێکی زۆر گرینگ بوو لە ژیانم هاتە دی، چونکە لە ساڵی ١٩٧٣ کاتێك پۆلی سێیەمی ناوەندیم تەواو کرد نووسراوێکم لە کاردۆ گەلاڵی سەرۆکی یەکێتی قوتابیانی کوردستان وەرگرت بۆ پشگیریکردنم لە وەرگیران لەو پەیمانگایە، بەلأم بەداخەوە چونکە شەهادەی ڕەگەزنامەی عێراقیم نەبوو نەمتوانی فایلەکەم پێشکەش بکەم. وەرگیرانی من لە پەیمانگای هونەرەجوانەکان نەك تەنها بۆمن بەڵکو بۆ گشت هونەرمەندەلاوەکانی ئەو سەردەمە لە شاری هەولێر ڕووداوێکی گرینگ بوو بۆیە هەر بۆ ساڵی دواتر هونەرمەند فەیسەڵ عوسمانیش چاوی لە من کردو دوای هەوڵو تەقەلایەکی زۆر ئەویش لەوێ وەرگیرا.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە لە ڕێکەوتی ١٩٧٧/١٠/١٦ بۆ خزمەتی سەربازی بانگکرامو سەرەتا لە بۆ مەشقکردن ڕەوانەی مەڵبەندی مەشقکردنی پیادە لە شاری کەرکوك کرامو دوای تەواوکردنی مەشق ڕەوانەی وەحدەی مەیدان گبی کرام لە کارێزە وشکەی شاری سلیمانی، بۆیە مەسەلەی خوێندنەکەم لە بەغدا بە زەحمەت کەوتو دەبوایە بۆ ئەنجامدانی ئەزموونەکان ئیجازە وەربگرم کە ئەمەش کارێکی ئاسان نەبوو. بەلأم خۆشبەختانە لەناو سەربازگەکەمان دەنگۆی دەستی هونەریم بلأوبۆوە بۆیە شەوێك یاریدەدەری ئامرەکەمان بەدوایدا ناردمو دوای خۆپێناساندن داوای ئەوەی لێکردم کە هەندێك تابلۆی هونەری بۆ دروست بکەم لەگەڵ پارچە نووسینێك بۆ سەر مێزەکەی بە دەستەواژەی (الحق يعلو ولا يعلى عليه) . جا بەم شێوەیە بووینە هاوڕێ تا ڕۆژێکیان ووتی لەو ڕۆژانە من بە کاری فەرمی دەچمە بەغدا

ئەگەر دەتەوێ بچیتە پەیمانگا لەگەڵم وەرە بە مەئموریە دەتبەم. منیش ووتم باشە، ئەوەبوو دوای چەند ڕۆژێك فەرمانی بۆ دەرکردمو ووتی بەیانی لە بەغدا لە وێسگەی شەمەندەفەر یەکتر دەبینینەوە. ئەو ڕۆژە بەڕێکەوتمو کە گەیشتمە بەغدا شەو لە هوتێلی ئەحمەد لە ساحەی مەیدان خەوتمو بۆ بەیانیەکەی جلی سەربازیم لەبەرکردو چومە ساحەی مەیدان بۆ شوێنی پاسەکان، بەڵام هەر زوو ئینزباتێکی سەربازی منی گرتو ڕاپێچی ناو زیلێکی کردم کە وردە وردە سەربازی سەرپێچیکەریان تێی دەئاخنی تا پڕ بوو ئەوسا ئێمەیان برد بۆ دایەرەی ئینزباتخانەی حارسیەو پانزە سەرپێچیان دایە پالم ئەوەی لەبیرم مابێ، نەبەستنی نیتاقو دابەزین بە جلی مەشقو لەپێکردنی پۆستاڵ لە جیاتی پێڵاوی سووكو نەتاشینی ڕیشو ....هتد بۆیە یەك مانگ زیندانیان بۆ بڕیمەوە بۆیە نەمتوانی ئامرەکەم ببینمە وەنە شمتوانی بچمە پەیمانگا. جا ئەمە وای کرد نەتوانم درێژە بە خوێندنم بدەم لە بەغداو ئەو حەسرەتە تاکو ئێستاش لە دڵو دەروونم ماوەتەوە.

زۆر ڕقم لە سەربازی دەبۆوە لەبەر زۆری زەبتو ڕەبتەکانی لەلایەك وە بەسووك تەماشاکردنی مرۆڤ لەلایەن پلە دارەکانەوە لەلایەکی ترەوە، بۆیە زۆر بە زەحمەت ڕۆژم لێ ئاوا دەبوو. بەڵام خوا ڕەحمی پێکردم کە من یەکێك بووم لەو کەسانەی کە پەیوەندیان بە شۆڕش کردبوو بۆیە لە ڕێکەوتی ١٩٧٨/٨/٦ بە نووسراوێکی نهێنی وەزارەتی بەرگری/ کارگێڕی گشتی ژمارە١١٥ لە ١٩٧٨/٧/٢٧بە پشتبەستن بە نووسراوی پارێزگای هەولێر/ کاروباری ناوخۆ نهێنی ژمارە ٥٦ لە ١٩٧٨/٧/٢٠ بەو هۆیەوەلە سەربازی تەسریح کرامو گەڕامەوە فەرمانگەکەی خۆم لە شاری هەولێر.

لە ساڵی ١٩٧٨ چومە خوازبێنی کچێکی کۆیی کە خۆشم دەویست و دوای یەك ساڵ دەسگیرانی چوینە ناو قەفەزی هاوسەرگیریەوەو هەر لەو کاتەوە تاکو ئێستا بەیەکەوە دەژینو خاوەنی چوار مندالین، دوو کوڕو دوو

کچ (ژاڵەو چیاییو ئالاّو محەمەد) شوکر بۆ خوا خێزانێکی بەختـەوەر بـووین، هاوسەرەکەم کە ناوی سعادە عوسمان مەعروفە زۆر یارمەتی منو منالّـەکانی دا بۆ تەواوکردنی خوێندن. ئەوەبوو من بەردەوام بووم لە خوێندن تا دکتۆرام تەواو کرد، هەروەها منداڵەکانیشمان هەر هەموویان خوێندنیان تەواو کرد.

چـیایی ماسـتەری لـە موزیـك وەرگـرتو ئێسـتا مامۆسـتای زانکۆیـە لـە کۆلێژی هونەرەجوانەکان، ژاڵـەش بەکالۆریۆسـی لـە زمـانو ئـەدەبی کـوردی وەرگرتو مامۆستای ئامادەییە، محەمەدو ئالاّش پەیمانگای هونەرەجوانەکان بەشی شێوەکاریان تەواوکردو ئێستاش محمەد لـە کۆلێـژی هونەرەجوانـەکان درێژە بە خوێندنی خۆی دەدا.

لە سالّی ١٩٨٠ دوای هەلّگیرسانی جەنگی عیراقو ئێران جارێکی تر ناوی سەربازیم هاتەوەو ڕەوانەی معسکر تحریر کرام لـە شـاری بەغـدا. مـاوەی دوو سێ مانگ مەشقیان پێ کردین بـۆ ئـەوەی بمـان نێـرن بـۆ بـەرەکانی جـەنگ. ئێمەی سەربازە کوردەکان هەموو ڕۆژێك لەگەلّ یـەکتر ئـالّوگۆڕی بـیرو ڕامـان دەکرد سەبارەت بە مانەوەمان یـان ڕاکردنمـان چـونکە هـیچ ئومێـدێکمان بـە شەڕ ڕاوەستان نەبوو، بەلاّم لەبەر زەبرو زەنگـی ڕژێـمو ترسـی گـرتن بڕیـاری ڕاکردن لە سوپا ئاسـان نـەبوو بۆیـە بـە دەگمـەن لەگـەلّ ئـەم بڕیـارە بـوون. ڕۆژێك دوای مەشقکردن بۆ پشووێکی کورت ڕەوانەی بەر سێبەر کراین، شتێك زۆر سەرنجی ڕاکێشام هەر ئەمەش پالّی پێوەنام کە چاوەڕێی کـەس نەکـەم، بـە تـەنها بڕیـاری ڕاکـردن بـدەم. ئـەو شـوێنەی لێـی دانیشـتبووین پارچـە کۆنکریتێکی زۆر ئەستوور بوو، بەلاّم ئەوەی جێگای سـەرنج بـوو دەرچـوونی هەندێك فریزی سەوز کە کۆنکریتەکـەی تەقانـدبوو بـۆ ئـەوەی بێتـە دەرەوە. ڕووم لە برادەرەکانم کرد پێم ووتـن دەك داوەشـێین کـە بـە قـەدەر ئـەم گیـا نەرمو نۆلّە هێزمان نەبێ کە لە پێناوی ڕووناکیدا ئەم کۆنکریتـە ئەسـتوورەی تەقانـدووەو سـەری دەرهێنـاوە، بۆیـە مـن بڕیـاری خـۆمم داوەو هـەر لـەم

چرکەیەوە ڕادەکەمو ڕوو لە شاخەکانی کوردستان دەکەم خۆم لە پێناوی شەڕێکی بێ مانا بە کوشت نادەم. جا ئەوەبوو ڕام کردوو سەرەتا هاتمەوە هەولێرو دەفتەری خدمەی عەسکەریم لە ئەندازیار فارس سەعدی برام وەرگرت کە تیایدا ئاماژە بە دواخستنی ڕاژەی سەربازی براکەم کرابوو بۆ ماوەیەکی نادیار، ئەوجا بە ئۆتۆمۆبێل چوومە ماڵی خزمو کەسان لە خەلیفان. دوای ئەوەی چەند ڕۆژێك لەوێ مامەوە هەستم بە تەنیایی دەکردو کاتم لێ نەدەڕۆیشت چونکە خەڵکی ئەوێ هەمووی ئیشیان دەکردو درەنگ دەهاتنەوە. بۆیە بیرم لە کارێك دەکردەوە کە خۆمی پێ مەشغوڵ بکەم، دوای ڕاوێژکردن لەگەڵ مستەفا حوسامی کوڕە پلکەکەم کە وەستای بەستنی قالبی بنمێچی خانوو بوو، بەڵێنی پێدام ئەگەر تەختەی قالبی خانوو بکڕم هاوکاریم دەکاتو برا بچوکەکەی دەنێرێتە لای من تا ئەوکاتەی خۆم فێری پیشەکە دەبم. جا ئەوەبوو هەر بەو دەفتەر خدمەیەی لەگیرفانم بوو، گەڕامەوە شاری هەولێرو چومە فەرمانگەی فرۆشتنی کەرەستەی خانوو، بایی سێسەد دینار تەختەی فنلەندیو تەختەی چوارگۆشەم بۆ جسرەکان کڕیو لە شێخەللاش بەپێی پێویست ژمارەیەکی زۆر دارسپیندارم بۆ دەرسەکەکان کڕیو بە لۆریەك بردمە شارۆچکەی خەلیفانو کوڕە پلکێکم کە ناوی عبداللە حوسام بوو، داوام لێی کرد کە ببێتە شەریکم لەو تەختانە بەرامبەر کارکردنی لەگەڵمدا.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، لەو سەردەمدا دوای سەردانەکەی سەدام حوسێنی سەرۆك کۆماری عێراق بۆ ئەو شارۆچکەیە بە فەرمانێکی سەرۆکایەتی کۆمار بڕیاردرا خانووی شارستانی بۆ گشت دانیشتوانی شارۆچکەکە بکرێت، بۆیە ئیشی بەستنی قالب زۆر بوو، جا یەکەم خانوو کە بەستمان، خانووی کچە پلکێکی خۆم بوو کە بە پارەیەکی کەم بۆمان بەست، بەڵام بەستنی ئەو خانووە دەرگای خێری بۆ کردینەوەو لەناو

خـەلیفان دەنگـی دایـەوەو دەیـانووت وەسـتایەك لـە هـەولێر هـاتووەو وەكـو شاری هـەولێر قالبـەكان دەبەسـتێ‌و ئیشـەكەی زۆر جوانـە. جـا ئـەوەبوو تـا ماوەیەی چەند مانگێك خۆم بـەو كـارە خـەریك كـرد، بـەڵام دواتـر لـە ترسـی ئاشكرابوونی ڕاكردنەكەم بە باشمزانی خـەلیفان بـەجێ بهـێڵم‌و بچمە گونـدی مالمن لە سەرزێی بێخمە، بۆیە تەختەو گشت كەل‌و پەلـەكانی دارتاشـیم داوە مێردی كچەپلكەكەم بە پارەیەكی كەم، ئەویش وەك من ئاسا خۆی پـێ تـاقی كـردەوەو تـا سـاڵانێكی زۆر بـەكاری هێنـاو دەسـكەوتێكی باشـی لێیـەوە بەدەست كەوت.

بەهەرحاڵ، دوای فرۆشـتنی تەختـەكان چـومە گونـد، چـوار پێـنج مـاڵی تیابوو، زۆربەی پیاوەكانیان لە دەرەوەی گونـدبوون، خـەریكی ئـیش‌و كـاری قاچاخچێتی یان شتی تر بوون. هەرچـەندە بـۆمن ئـەو گونـدە مەنزلگایـەكی زۆر ئارام بوو، ناو شاخ‌و داخ بوو، ڕێگای ئۆتۆمۆبێلی بەسـەرەوە نـەبوو بۆیـە دەسـتی حكومـەتی نەدەگەیشـتێ، بـەڵام لەبەرئـەوەی تـەنیا بـووم، كـاتم لێ نەدەڕۆیشـت. جـا بـۆ بەسـەربردنی كـات ڕۆژانـە هـەر لـە خۆرهەڵاتـەوە تـا خۆرئاوابوون دەچـوومە سـەر زێ‌و ڕادیۆیـەكی بچـوكم بـە گوێمـەوە دەنـا بـۆ گوێبیستبوونی هەواڵەكان بـە ئومێـدی ڕاوەسـتانی شـەڕو گەڕانـەوەم بـۆ نـاو خانەوادەكـەم، بـەڵام چـاوەڕوانیەكەم وەكـو چـاوەڕوانی گـۆدۆ بـوو، هـیچ تروسكاییێكم بەدی نەدەكرد.

یەكێك لەو كەسانەی لەو گونـدە ناسـیم وسـوی عـەلی بـەگ بـوو، كـە لـە تەمەنی من نزیك بوو، پیاوێكی ڕۆشنبیرو تێگەیشتوو بوو، پێشمەرگەی كـۆنی شۆڕشی ئەیلول بوو، كە دەمبینی یادەوەرییەكانی پێشـمەرگایەتی خـۆی بـۆ دەگێڕامـەوە. جارێـك لـێم پرسـی عـەونی یوسـف بـۆی گێڕامـەوە كاتێـك بـە فەرمانی مەلا مستەفا دەگیرێ‌و لە سەرەوە زیندانی دەكەن، وسـو ناوێـك كـە پێشـمەرگەیەكی گـەنج بـوو پاسـەوانی زیندانەكـەم بـوو زۆر یارمـەتی دەدام‌و

ڕێزێکی زۆری لێ دەنام، ئایا ئەو کەسە تۆ نەبووی؟ ووتی بەڵێ من بووم. جا ئەوەبوو بە درێژی ڕووداوەکەی بۆ گێڕامەوە.

نزیکەی چەند مانگێك لەو گوندە خۆم ڕاگرت بەلاَم دووریم لە خێزانەکەمو دایكو باوكو خوشكو براکەم خەمباریان کردبووم، بۆیە بڕیارم دا هەرچۆنێك بێت خۆم بدەم بە دەستی حکومەتەوەو بگەڕێمەوە وەحدەکەمان بۆ تەواوکردنی خزمەتی سەربازی.

جا ئەوەبوو گەڕامەوە هەولێرو شەوێك لە ماڵی خۆمان لەگەڵ هاوسەرەکەمو کچە بچکۆلانەکەم (ژاڵە) مامەوەو بۆ بەیانی بە سوود وەرگرتن لە لێبووردنێکی گشتی خۆم دا بە دەستەوەو لە ڕێگەی سریەی ئینزباتی هەولێر بۆ وەحدەکەمان لە کەرتی ئەهوازی ناو خاکی ئێران گەڕامەوە. سێ شەوو سێ ڕۆژ بە تەسفیرات لەڕێگار گرتووخانەکانی ئینزباتەوە، بە ئەشکەنجەیەکی زۆرەوە ڕەوانەی وەحدەکەم کرامەوە. مەعاناتی ئەم سێ شەوەم بەقەد مەعاناتی هەموو ژیانم بوو، نازانم چۆن باسی بکەم. لەو زیندانانەدا شوێنی قاچەکانم نەبوو لێی دابنێم ئەوەی تینووشیبا لە شووشەی میز ئاویان بۆ دەهێنا، مامەڵەیەکی زۆر نامرۆڤانەیان لەگەڵ دەکردین. بەهەرحاڵ، دوای سێ شەوو سێ ڕۆژ لە مەعاناتی ڕێگاو برسێتیو تینوێتیو مامەڵەی خراپ لە هەولێرەوە گەیشتمەوە سەربازگەکەمان لە ئەهواز لە نزیك شاری محەمەرە. برادەرێکی منالێم هەبوو ناوی تاهیر مەولود بوو دانیشتووی گەڕەکی سێتاقان بوو، بەرەو پیرمەوە هاتو باوەشی پێداکردمو ووتی لە ترسی شەڕ زۆربەی سەربازەکانمان ڕایان کردووەو ئەوەی لێرەش مابێتەوە یان لە بێ دەسەلاَتی ماوەتەوە یانیش چاوەڕێی ئیجازە دەکات، ئەوجارە بڕواتەوە بەیەکجاری ناگەڕێتەوە، تۆ خوا لێی گۆڕیویت بەو ڕۆژە ڕەشە گەڕایتەوە؟! منیش ووتم منیش لە ناچاری گەڕاومەتەوە، هیچ شوێنێك نەبوو

تیـای ئاسـووده بم، بۆیـه گـوتم مـادام هـەر لـه خانەوادەکـەم دووربم باشـتره بگەڕێمەوە سەربازی خۆ هیچ نەبێ ئیجازەو ئیجازە دەگەڕێمەوە ناویان.

ئیتر بەم شێوەیە چەند مانگێکی تر خـۆم ڕاگـرت، بـەڕۆژ لـه پشـتەوەی ساتری خۆڵ واجباتمان دەگرتو بە شەویش یان بۆ کەمین دەیانبردین یان بۆ دەوریـەی قیتـالی کـه هـەر هـەمووی ڕێگـای مـانو نـەمان بـوون، نـاوه نـاوه سـەربازمان لێ دەکـوژراو یـان برینـدار دەبـوون، بـه بـەردەوامی تۆپبـاران دەکراینو دەخراینە بەر دەسرێژی گولـەی بیکەیسـیو دۆشـکە، خـوا ئەجـەلی نەهێنابووین دەنا ساچمەی تۆپو کوله له دەوروپشـتمان هەڵدەبەزیـەوە.وای لێهاتبوو لـەم کـەشو هـەوا تراژیدیایـه ڕاهـاتبووین، زۆری نەخایانـد سـەرۆکی ئەرکانی سوپای عێراق عبدالجبار شنشـل لەگـەڵ کۆمـەڵێك ئەفسـەری پلـەدار هاتنه لامانو ئامادەباشـییان بـۆ بەرپەرچـدانەوەی هێرشـێکی گریمانـەکراوی ئـــێران لـــه ناوچـــەکه کـــردو بـــەم هۆیەشـــەوە ئێمـــەیان خســـتەحاڵەتی ئامادەباشیەوەو ئیجازەشیان ڕاگرت.

ڕاگرتنی ئیجازە ماوەی دوو مـانگی خایانـدو ئەگـەری هێرشـکردنه سـەر وەحدەکـەشمان زۆر نزیـك بـۆوە، بۆیـه ورەمـان بـەرداو دەیـان بیرۆکـه بـه خەیاڵمانـدادەهات بـۆ هـەڵاتن لـەو شـەڕە نەگریسـه. شـەوێك لەلایـەن ئـامری سەربازگەکەمان ئاگـادار کراینـەوە کـه ئەمشـەو یەکەیـەکی سـەربازی ئێرانـی هێرشمـان دەکاتـه سـەر پێویسـته لـه حاڵـەتی ئامادەباشـیدا بـینو بەهـەموو چـەکو تەقەمـەنییێك وەڵامیـان بدەینـەوە.جا ئـەوەبوو هێنـدەی پێنەچـوو لـه هەموو لایەك بـووە تەقـەو گولـه بـه گولـه دەکەوتـەوە، چـەند سـەربازێکمان برینـدار بـوو، کەتیبەیـەکی دەبابـه لـه حـەقلی ئەلغامـەکان بـەرەو سـاتری ئێرانیەکان پەڕیەوە، ڕۆح له جێگایەکی قایم بوو دەرنەدەهات، سـەربازێکمان له ترسان میزی بەخۆی داکرد، ئەوانی تریش وەسـیەتیان لای یـەکتر دەکـرد، دیمـــەنێکی تراژیـــدی بـــوو، قـــەد تەســـەوری ئەمـــەم نـــەدەکرد دەنـــا قـــەت نەدەگەڕامەوە، زۆر پەشیمان بووم بەڵام پەشیمانی هیچ داد نادات. چـەکێکی ئاربیکـەیم لابـوو، فیشـەکێکم خسـتە نـاو سـەبەتانەو سـوارم کـرد دوایـیش

مەخزەنەکەم بە پڕکراوەیی لە چەکەکەم قایم کردەوەو بانگی تاهیر مەولودی هاوڕێم کردوو ووتم لەبەر خاتری ژنو منداڵەکانم نامەوێ لێرە بکوژرێم یان بە دیل بگیرێم، بۆیە تکایە بە چەکەکەی خۆم گولەیەك لە دەستی چەپەم بدە با بریندار بم باشترە لەوەی تووشی چارەنووسێکی لەوە خراپتر بم. سەرەتا ئەو برادەرەم ڕازی نەبوو، بەلاًمدواتر بەهەر شێوەیەك بێت قەناعەتم پێی هێناو لە دووری چەند هەنگاوێکەوە فیشەکێکی نا بە دەستمەوەو نیشانی زۆر ڕاست بوو بە یەکەم فیشەك ئامانجەکەی پێکاو برینداری کردم. جا هیچ هاوارم نەکردو دانم بەخۆم داگرت تا سەبەتانەی چەکەمم خاوێن کردەوەو سناریۆیەکمان ڕێکخست بۆ ئەم مەبەستە. ووتم تۆ بگەڕێوە شوێنی خۆت ئەوسا من هاواردەکەمو بە دەنگی بەرز دەڵێم فریام کەون بریندار بووم. بەم شێوەیە سوکە نواندنێکمان کردو ئەویش ئەفسەرو سەربازەکانی ئەو دەوروبەرەی لێ کۆکردمەوەو خوێنیش بە لاشەمدا جۆگەلەی بەستبوو، بۆیە منیان بردە بەرەکانی پشتەوەو بەری بەیان بە جێبێکی بچووك منیان بردە نەخۆشخانەی سەربازی لە شاری بەسرەو لەوێ چارەسەری سەرەتاییان بۆ ئەنجام دامو پشکنینیان بۆ کردمو نووسیان بە گولەی قەناس بریندار بووە. جا دوو حەفتە ئیجازەی نەخۆشییان دامێ لەگەڵ سێسەد دینار وەك پاداشتو هەر بەو شەوە بە شەمەندەفەر بە ڕێگای بەغدا لەوێش بۆ موسڵو لەوێش بە پاس بەرەو هەولێر گەڕامەوە.

لەو نەخۆشخانەیە چاوم کەوت بە عبدالباسیت کەریم کە هاوڕێی منداڵیمو خەڵکی یەك گەڕەك بووین، ئەوکاتە یاریدەدەری پزیشکی بوو لەو نەخۆشخانەیەداو یاوەری ئەو تیمە پزیشکییە بوو کە پشکنینیان بۆ کردم (ئێستا دکتۆرای هەیەو لە کۆلێژی کشتوکاڵە لە زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر) لەم ساڵانەی دواییدا نهێنییێکی گەورەی بۆ درکاندمو ووتی دەزانی ئەگەر سەرۆکی لیژنە پزیشییەکە نەقیبێکی کورد نەبایە تۆ زیندانی دەکرای؟

چونکە ئەوان زانیان کە ئەو فیشەکەی تۆی پێ بریندار بوویت عێراقییە، بەڵام چاوپۆشییان لێ کرد.

ماوەی چەندمانگێك بۆ چارەسەری سەردانی نەخۆشخانەی سەربازی شاری هەولێرم دەکردوو ئەو ماوەیەشم بە ئیجازەی نەخۆشی بەسەر برد تا دواتر ئیجازەکەم تەواو بوو، دەبوایە پەیوەندی بە وەحدەکەمان بکەمەوە، بەڵام نەچوومەوەو دووبارە تووشی فیلاری بوومەوە. بەڵام ئەوجارەیان ڕام نەکرد بۆ هیچ شوێنێكو لە شاری هەولێر مامەوەو ناوە ناوە ئیجازەیەکی نەخۆشیم لە ئیجازە بەسەرچووە کۆنەکانی خۆم دوای گۆڕینی بەروارەکەی کۆپی دەکردەوەو بەبێ ترس بەکارم دەهێنا. دوای ماوەیەك دوو بڕیار بۆ لێبووردنی سەربازە ڕاکردووە کوردەکان دەرچوو کە بە بڕیاری دوو سایت ناوزەدکرابوو. دیسان خۆم دا بە دەستەوە، بەڵام ئەو جارەیان نەیان گەڕاندینەوە بۆ وەحدەکانی خۆمان، بەسەر وەحدە سەربازییەکانی ناو شاری هەولێر دابەشیان کردینو منیش بەر نەخۆشخانەی سەربازی شاری هەولێر کەوتمو لەوێ تەنسیب کرام.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، ماوەی چەندمانگێك بۆ چارەسەری سەردانی نەخۆشخانەی سەربازی شاری هەولێرم دەکردوو ئەو ماوەیەشم بە ئیجازەی نەخۆشی بەسەر برد تا دواتر هەر لەو نەخۆشخانەیە تەنسیب کرامو دواتر بەپێی نوسراوی وەزارەتی بەرگری ژمارە ٨٣٨ ١٩٨٣/١/٢٠ڕێگای دا بە تەسریح کردنی سەربازە کوردەکان بە بڕی پێنجسەد دینار، جا ئەوەبوو چومەوە یەکە سەربازییەکەم ئەوکاتە گەڕابوونەوە ڕۆژهەڵاتی بەسرەو پارەکەم داو لە ڕێکەوتی ١٩٨٣/١/٢١ لە خزمەتی سەربازی بەخشرامو تا ڕژێم ڕووخا هیچی تر سەربازیم نەکردەوە.

## یەکەم کتابم چۆن چاپکرد

لـە کۆتـایی سـاڵی ١٩٧٦ مـنو سـابیر ڕەشـید بـە هاوبـەش کۆمەڵـە چیرۆکێکمان بە ناوی (شـەش کورتـە چـیرۆکی کـوردی) ئامـادەکردو بردمانـە فەرمانگەی چاودێری چاپەمەنیەکان لە کۆشکی سپی لە شەقامی پەنجاو دوو لە شاری بەغداد بۆ وەرگرتنی ڕەزامەندی بۆ چاپو بڵاوکردنەوەی.

شـایەنی ئاماژەبۆکردنـە، مـنو سـابیر ڕەشـید فێڵمـان لـە ڕەقابـە کـرد، ناونیشانی چیرۆکەکانمان بە جیا لە لاپەڕەیەکی سەربەخۆ نووسـیو شۆڕشـی فەلەستینو شیلیو خەباتەکانی تری دونیامـان کـردە ناونیشـانی چـیرۆکەکان بـۆ خەڵەتانـدنی چـاودێرەکانی حکومـەت، چـونکە نـاوەڕۆکی چـیرۆکەکانمان نەتـەوەیی بـوونو گوزارشـتیان لـە خـەباتی کـوردو کوردسـتان دەکـرد، بـە تایبەتی لەناوچـوونی شۆڕشـی کـورد دوای ڕێککەوتنـە شـوومەکەی جـەزائیر، بۆیە دەمانزانی ئەگەر شتێکی وا نەکـەین ئاشـکرا دەبـینو چـیرۆکەکانمان لـە مقەسی چاودێر ڕزگاری نابێت.

جا ئەوەبوو دوای گەڕانەوەی لە فەرمانگەی سانسۆری چـاپەمەنیەکانو وەرگرتنـی ڕەزامەنـدی بـۆ بڵاوکردنـەوەی، گشـت ناونیشـانەکانمان گـۆڕیو ناونیشانە ڕاستەقینەکانمان لەسەری نووسیوە. چووینە چاپخانەی شـارەوانی هەولێر لە گەڕەکی ئیسکان، ئەو کاتە مامۆستا مەغدید سـۆران بەڕێوەبـەری چاپخانەکە بوو، هـەردوو شـاعیران سـەعدوڵلا پـەرۆشو جەوهـەر کرمـانجیش پیتچن بوون لەو چاپخانەیەو پیتەکانیان یەکە یەکـە بـە دەسـت ڕیـز دەکـردو بەو شێوە کلاسیکییە کاری چاپەمەنی لەو چاپخانەیە دەکرا.

بە هەرحاڵ، هەر ئەو کاتـە ئـازاد عبدالواحیـد کـۆییش کتـابی ئەختـەری ئامادەی چاپ بوو، بەیەکەوە پێشکەشی مامۆستا مەغدید سۆرانمان کـرد بـۆ چاپکردنیان. مامۆستا مەغدید سـۆران ووتـی کتابەکـەی تـۆو سـابیر ڕەشـید نەوەتو حـەوت دینـاری تـێ دەچـێتو ئـەوەی ئـازادیش سەدوبیسـت دینـار، پێویستە بەر لە دەسپێکردنی چاپ ئەو بڕە پارەیە بدەن. ئەو بڕەپارەیـە بـۆ

ئێمە گەلێك زۆر بوو چونكە ئەوكاتە مووچەی مانگانەی منو ئازاد تەنها سیو چوار دینار بوو، سابیر ڕەشیدیش وەزیفەی نەبوو بەلاَم تۆزێك لە ئێمە وەزعی باشتر بوو بەوەی كە باوكی بازرگان بوو. منو ئازاد بە پێی نووسراوی شارەوانی هەولێر بە ژمارە ١٧٤٨٩/١/١ لە ١٩٧٦/١١/٢٨ڕەزامەندی شارەوانیمان وەرگرت بۆ چاپكردنی كتابەكانمان بە قیستی مانگانەو سابیر ڕەشیدیش دەخیلەكەی خۆی شكاندو گشت پارەكەی خستە بەر دەستمو بەو شێوەیە كتابەكانمان چاپكرد.

كتابەكەمان دەنگی دایەوەو كەسانێكی زۆر لەسەریان نووسی، لەوانە لەتیف هەڵمەتو فەیسەڵ مستەفاو مومتاز حەیدەریو مەحمود زامدارو تەنانەت هەندێكیش بە نامە پیرۆزباییان لێكردین، لەوانە هونەرمەند مەهدی ئومێد لە باشووری عێراقەوە نامەی پیرۆزبایی بۆ ناردین. هەروەها مامۆستا گیوی موكریانیش دەستخۆشی لێكردینو دانەیەكی لێ وەرگرتینو بەدیاری بۆ كوردستانی كچی نارد لە سۆفێتی جاران كە لەوێ خەریكی خوێندنی دكتۆرابوو.

شایەنی ئاماژەبۆكردنە، ئەم كارەی ئێمە بووە هاندەرێك بۆ گەنجانی سەردەمی خۆمان، هەندێكیان چاویان لە ئێمە كردو بەرهەمەكانیان بەچاپ گەیاند، لەوانە ئەبووبەكر خۆشناو دیوانە شیعری (كۆلۆمبس كیشوەرێكی تر دەدۆزێتەوە) ی چاپكرد،و بەكر زاناش (پێناسەكەم) ی چاپكرد،و دواتر ئەمە بووە دیاردەو زۆر لاوی تریش بەرهەمەكانیان چاپكرد.

## چۆن خوێندنی زانکۆییم تەواو کرد

هەروەکو پێشتر ئاماژەم پێکرد، من هەر لەو کاتەی پۆلی پێنجەمی ئەدەبیم لە ئامادەیی کوردستان تەواوکرد، لەئەمینداریێتی گشتی شارەوانیو هاوینەهەوارەکان دامەزرام، بۆیە خوێندنەکەم تەواو نەکرد تا ماوەی چەند ساڵێك. بەڵام دوای ئەوەی شیخ رەقیبی سەرۆك تێبینەرانی هۆبەکەمان لە بەشی خۆیەتی بەهۆی تەمەنەوە خانەنشین کرا، ئێمە حەوت فەرمانبەربووین بێ بەرپرس ماینەوە تا چەند رۆژێك کە من لەناویاندا لە هەموویان شارەزاترو کۆنتر بووم لە کاروباری خۆیەتی، کەچی لەپڕ سامیە محەمەد کە دەرچووی کۆلێژی کارگێڕیو ئابوری بوو ماوەی چەند مانگێك دامەزرابوو کردیان بە بەرپرسی ئێمە هەر لەبەر ئەوەی ناوبراو بڕوانامەی بەکالۆریۆسی هەبوو و ئێمەش ناوەندی. بۆ ماوەی ساڵێك بە فعلی گشت کاروبارەکانی ئەو بەشە من بەڕێوەم دەبرد کەچی گشت سوپاسو پێزانینو پاداشتەکان دەدرایە ناوبراو، ئەمەش منی زۆر نیگەران کرد، بۆیە بڕیارم دا بگەڕێمەوە بەرخوێندنو بەهەرشێوەیەك بێت خوێندنەکەم تەواو بکەم مادام پێوەرەکە تەنها بڕوانامەیە نەك شارەزایی. جا ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٨٤خوێندنەکەم گواستەوە بۆ ئامادەیی هەولێری ئێواران، بۆ وەرگێرانیشم مامۆستا فوئاد حەمید زەنوون کە ئەو کاتە یاریدەدەری بەڕێوەبەر بوو زۆر یارمەتی دام. بە هەرحاڵ ڕوو بەڕووی زۆر ئاستەنگ بوومەوە، لەوانە گۆڕانی پرۆگرامی خوێندن بە تایبەتی بیرکاریو ئینگلیزی، سەبارەت بە بیرکاری بۆ چەند هەفتەیەك مامۆستا جەلالە فەندی لە ماڵەوە وانەی تایبەتی پێم دەداو بۆ وانەی ئینگلیزیش مامۆستا عومەر کۆیی مەلزەمەیەکی چڕوپڕی بابەتەکەی پێشکەش کردم کە زۆر جیاوازی هەبوو لەگەڵ ئەو زانیارییانەی لەناو پۆل پێی دەووتینەوە، بەمەش زاڵ بووم بەسەر ئاستەنگەکانو ترسی کەوتنم نەما.

هەروەها سامیە محەمەدو ئەو خاتوونانەی کاریان لەگەڵ دەکردم زۆر یارمەتیان دام تا ئەزموونەکانم بە سەرکەوتوویی تەواو کرد، هەروەها بە

درێژایی ماوەی خوێندنم لەو کاتەوە تا تـەواو کردنـی کۆلێـژیش بـە خوێنـدنی دکتۆراشـــەوە هاوســـەرەکەم زۆر یاریـــدەدەرو پاڵپشـــتو هانـــدەرم بـــوو بەشێوەیەك زۆربەی بەرپرسیارێتییەکانی خێزانی خستبووە سەر شانی خـۆی بۆیە لەم ڕووەوە پشت ئەستووربووم‌و تا مردن قەرزاریانم. هەروەها قـەرزاری باوکیشـمم کـە هـەر لـە منالّیـەوە زۆر هـانی دەدایـن بـۆ خوێنـدن‌و نموونـەی کەسـانی عوسـامی بـۆ دەهێنایـنـەوە کـە ئەمـەش هەمیشـە لـە مێشـکمان دەخولایەوە.

لـە قۆنـاغی خوێنـدنی زانکۆییمـدا، گـەلێك چـالاکی هونـەری‌و ئـەدەبیم دەنوانـد بـە بۆنـەی ئاهەنگـەکانی ڕۆژی زانکـۆ. لـە یـەکێك لـە ئاهەنگەکانـدا، لەسەر شانۆی کۆلێژی یاسا، مەنەلۆجی (کاکی قوتابی بخوێنە واز لە گـەڕانت بێنە ... هـەر خوێنـدن بـە کـەڵکت دێ چـاوی شـتی تـر بقوچـێنە)م ووت کـە تێکسـت و ئاوازەکـەی هـی خـۆم بـوو، شـاکر حمـدامین ڕۆژبـەیانی‌و جـەمال جەلال‌و برایم اسماعیل‌و هێرش حسین‌و ئاسۆ تاهیر کۆرس بوون‌و لە دوای من دەیانووتەوە.

ئەمەی خوارەوەش دەقەکەیەتی:

کاکی قوتابی بخوێنە واز لە گەڕانت بێنە
هەر خوێندن بە کەلکت دێ چاوی شتی تر بقوچێنە
بەسیەو مەڕۆ بۆ بازاڕ بۆ فیتە بەدەورەی شار
لە کۆلآنی تەنگەبەر لەکچان مەگرە پەلار
جگەرە کێشان وازبێنە ناوی مەشروب مەهێنە
ئەو پارەی بۆت دەنێرن بەفیڕۆ مەی تەلفێنە
بە ناوی خۆشەویستی دەستی‌کچان دەبەستی
وەعدت بە چەند کەس داوە لەگەڵ کامیان ڕاستی
زوکەو تۆزێك بیرکەوە هۆشت بێنە سەرەوە
ئەو هەلآنەی کردوتن زووکەو ڕاستی کەرەوە

وانەكانت دەربێنە
چاوێكی لێ بخشێنە

یەكی جارێكو دوو جار
بیخوێنەو وازمەهێنە

نەكەی بیری قۆپیە كەی
پشت لە دەرسەكانت كەی

دەردێكی كوشندەیە
گەر خۆت لێی نەجات نەدەی

هەروەها شانۆگەری (تاوان) م نووسیەوەو لە رێكەوتی ١٩٨٨/١/٥ لەسەر شانۆی كۆلێژی یاسا نمایشكرا. ئەم شانۆگەریە لە دەرهێنانی برایم ئیسماعیلو نواندنی منو جەمال جەلالو برایم ئیسماعیلو هێرش حوسێنو سۆران جمشید بوو. وە لە ساڵی ١٩٨٩ شانۆگەری (تەلەفزیۆنی ساڵی ٢٠٠٠) م نووسیەوەو لە هەمان ساڵ لەسەر شانۆی كۆلێژی یاسا نمایشكرا. ئەم شانۆگەریە لە دەرهێنانی برایم ئیسماعیلو نواندنی منو ئاسۆ تاهیرو هێرش حوسێنو جەمال جەلالو ئاشتی عەزیزو برایم ئیسماعیل بوو.

وە لە بواری هونەری شێوەكاریشەوە، بەشداریم لە گشت چالاكیەكانی كۆلێژدەكرد. بە تایبەتی لە ١٩٨٥/١٢/٣٠ پیشانگایەكی تایبەتی شێوەكاریم كردەوەو دەیان تابلۆی شێوەكاریم تیایدا نمایش كرد.

شایەنی ئاماژەبۆكردنە، لە بواری توێژینەوەی زانستیش، گەلێك چالاكیم هەبوو، تەنانەت لەبەر ئەو متمانە زانستیەی كە مامۆستاكان بە منیان هەبوو، لە كۆنگرەی زانستی توێژینەوەی قوتابیان، منیان لەگەڵ خۆیان بە فەرمی وەك هەڵسەنگێنەرو ئەندامی لیژنەی تاوتوێكردنی ئەو توێژینەوانەی پێشكەشی كۆنگرە كرابوون ناوزەد كرد. هەروەها لە ساڵی ١٩٨٦ توێژینەوەیەكم بە ناوونیشانی (حق المؤجر في طلب اخلاء المأجور) پێشكەش بە كۆنگرەی زانستی توێژینەوەی قوتابیان كردو لەسەر ئاستی كۆلێژو زانكۆ بە پلەی یەكەم دەرچوو وبەو هۆیەشەوە بەشداربووم لە كۆنگرەی زانستی توێژینەوەی قوتابیانی زانكۆكانی عێراق لە شاری بەغدا كە بە سەرپەرشتی وەزارەتی خوێندنی باڵای عێراقی ئەنجام درا.

## ماوەی کارکردنم لە ئەمینداریێتی گشتی شارەوانیو هاوینەهەوارەکانو چەند یادەوەرییێك

دامەزرانم لەو فەرمانگەیە بەرێکەوت بوو، لە ساڵی ١٩٧٦رۆژێك منو ئازاد عبدالواحد حەوێزی بەبەردەم دیوانی پاریزگای هەولێر تێپەڕدەبووین، هاتە خەیاڵمان سەردانی پارێزگا بکەین بۆ دامەزراندنمان، جا ئەوەبوو دوای پڕکردنەوەی فۆرم، دوای ماوەیەك ئاگاداریان کردینەوە کە سەردانی ئەنجومەنی گشتی ڕاژە بکەین لە شاری بەغدا بۆ بەشداریکردن لە تاقیکردنەوەی کێبڕکێ. جا ئەوەبوو کە چووین نزیکەی سەدکەس بەشداری ئەو ئەزموونە بوون بەڵام بەختی من ووتیان دەتوانن بە زمانی عەرەبی یان کوردی وەڵام بدەنەوە، بەمەش کارەکەم زۆر ئاسان بوو بۆیە لە ئەنجامدا هەردووکمان لە نێوان دەرچووەکاندابووینو لە دیوانی ئەمینداریێتی گشتی شارەوانیو هاوینەهەوارەکان دامەزراین کە ئەوکاتە سیروان عبداللە جاف ئەمیندار بوو، مرۆڤێکی زۆر زیرەكو بوێر بوو لەسەر دەستی ئەو زۆر شت فێربووم بە تایبەتی بوێری لە ڕاپەڕاندنی کارەکاندا.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، یەکێك لە ئەمیندارە گشتییەکانمان ئەندازیار محمەد محی الدین شەریف بوو، مرۆڤێکی کوردپەرو بێ فیز بوو، دەرگای بۆ هەموومان کرابۆوە، هەرچەندە وەکو سیروان جاف بوێر نەبوو بەڵام ئەوەی لە توانای دا بوایە درێغی نەدەکردو زۆرجاران دڵی خۆی بۆمن دەکردەوەو باوەڕی تەواوی پێم هەبوو. زۆر جار بەڕێوەبەری نووسینگەکەی خۆی بە ئیشو کار دەناردە دەرەوەو منی لە شوێنی ئەو دادەناو داوای لێ دەکردم بە نووسراوێکی نهێنی بە لیستێك ناوی ئەو کەسانەی کە لەماوەی مانگێکدا سەردانیان کردووە، بۆ دیوانی سەرۆکایەتی کۆمار بنێرم کە ئەمە دەبوایە مانگانە ئەنجام بدرێ. جا یەکەم جارم بوو ئەم کارە بکەم، کاتێك نووسراوەکەم بردە بەردەمیو سەیری ناوەکانی ناو لیستەکەی کرد، گووتی

باوکە ئەگەر ئەم لیستە بەم هەموو ناوانەوە بچێتە سەرۆکایەتی کۆمار لەکارم لادەدەنو دووریش نیە بشمخەنە زیندانەوە ! ! منیش ووتم تێناگەم مەبەستت چیە، بە قەڵەمەکە خەتی هێنا بەسەر ناوی زۆربەی کەسەکانو تەنها چەندناوێکی هێشتەوە لەنێوانیاندا هەندێ گەورە سەرۆك جاش نامەوێ ناویان بهێنم، ووتی باوە ئەی بۆ من تۆ لەم کاتانەدا دەهێنمە لای خۆم چونکە ئەو فەرمانبەرەی تر دەرچووی پەیمانگەی ئەمنی قەومییەو بەعسیێکی تۆخەو سەرم دەکا بە پەتەوە، تۆ لەمەودوا تەنها ناوی ئەو کەسانە بنووسە کە سەگو سەگ باوکنو جاش یان بەعسین، دەنا واتێدەگەن کە من دەرگام بۆ نەیارەکانی حکومەت کردۆتەوەو کەسێکی خۆشەویستملای خەڵك، ئەوانیش ئەمەیان ناوێ.

ئیتر لەو ڕۆژەوە بۆم دەرکەوت کە ئەم زاتە ئەگەر بێلایەنیش نەبێت مەعدەنی پاکەو منیش بۆ یارمەتی دانی خەڵکی بێلایەنو زوڵملێکراو داوام لێی دەکردو بەقسەی دەکردم، تەنانەتجارێك بە نووسراوێك داوای گواستنەوەی فەرمانبەرێکمان بۆ هاتبوو ناوی مەهدی بوون فەرمانبەرانی فەرمانگەکەمان بەمە زۆر نارەحەت بوون هاتنە لامو ووتیان ئەو کەسە سەر بە دەزگای هەولگری عێراقەو ئەگەر بێتە ئێرە زۆرمان ئازار دەدات بە تایبەتی بێلایەنەکان. من لەوە دڵنیا نەبووم، بەلاّم کاتێك کە بێوەژنەکەی عبد الرزاق نایفی کۆنە سەرۆك وەزیرانی عێراق هاتە لامو لە هەواڵی ناوبراوی پرسی، بە تەواوەتی دڵنیابووم، بۆیە چوومە لای ئەمینداری گشتیو پێم ووت مامۆستا فلاّنە کەس سەر بە دەزگای هەواڵگرییەو فەرمانبەرەکان نیگەرانن لە گواستنەوەی بۆ ئێرە بۆیە باشتر وایە ڕەزامەندی لەسەر نەکەیت. جا ئەوەبوو بە قسەی کردمو ڕەتی کردەوە بەمەش هەمووبان دڵخۆش بووین.

هەر لە سەردەمی ئەو بەرێزە، ڕژێمی پێشوو لە ماوەی جەنگی عێراقو ئێراندا بڕیاریدا دوو سندوق لە هەر فەرمانگەیەك دابنرێتو فەرمانبەران

سەرپشك بكرێن بۆ یەكێك لە دوو بژاردە، ئارەزوو دەكەم لـە بـەرگریكردن لـە نیشتمان یان ئارەزوو ناكەم لە بەرگریكردن لە نیشتمانو بخرێتـە نـاو یـەكێك لەو دوو سندوقانە. جا ئەوەبوو گشت فەرمانبەرانی فەرمانگەكـەمان بـژاردەی دووەم بـە ڕەفزكردنـی بـەرگریكردن لـە نیشـتممانیان هەڵبـژارد تـەنها كاتـب تابیعەیەك نـەبێت كـە نـاوی عبـدالخالق بـوو بـژاردەی یەكـەمی هەڵبـژاردو بـە شەرمەزارییەوە خستیە ناو سندوقەكەوە.

شایەنی ئاماژەبۆكردنە ماوەیەكی زۆر بەسەر ئەم ڕووداوەدا تێپـەڕی بـێ ئەوەی هەست بە هیچ ئاكامێكی بكەین، تا ئەو كاتەی ناوم لە كۆلێژی یاسای زانكۆی سەلاحەددین دەرچوو وویستم خوێندن تەواو بكەمو بۆ ئەم مەبەسـتە داوای مۆڵـەتی خوێنـدنی بـە مووچـەی تـەواوم كـرد، بـەلاّم وێـڕای ئـەوەی ئەمینـداری گشـتی زۆری خـۆش دەویسـتم كەچـی ڕەزامەنـدی لەسـەر نـەدا. منیش چوومە لای بەڕێزیانو ووتم مامۆستا گشـت مـەرجێكی یاسـاییم تیایـە، بۆچی ڕەزامەندیت لەسـەر داواكـەم نـەكردووە؟ ووتـی بـاوە مـن ئـەوە دەزانم بەلاّم كەسێك هەیە ڕەزامەندی لەسەر داواكەت نەداوەو منیش هیچ دەسەلاّتی ئەوم نیە. منیش بە سەرسوڕمانەوە ووتم بۆ كەسێكی لەتۆ گەورەتر هەیە لەو فەرمانگەیە؟ ووتی نا بەو مانایە نا، بەلاّم هەمزە عوسمـان زابـت ئـەمنی ئـەم فەرمانگەیەیەو هامشێكی خراپی بۆ نووسیویت ناتوانم پێشانت بـدەم، ئەگـەر دەتوانی كاری تێ بكەی بڕۆ لای بەلاّم ناوی من مەهێنە بزانە چی دەڵێ.

جـا ئـەوەبوو چـومەلای لـە شـوێنی كارەكـەی كـە بەڕێوەبـەری هاوینەهەوارەكان بوو لە دیوانی ئەمیندارێیەكەمانو پێم ووت مامۆستا هەمزە لەبەرچی ڕەزامەندیت لەسەر مەعامەلەكەم نەكردووە؟ ووتی كـوڕم تـۆ ڕەتـت كـردەوە بـەرگری لـە نیشـتمانەكەت بكـەی ئێسـتاش چـۆن دەتـەوێ ئێمـەش ڕەزامەندیت بۆ بكـەین بخـوێنی. وووتم جـا ئـەوە چ پەیوەنـدیێكی بـە یاسـاو ڕێساكانی مۆڵەتی خوێندنەوە هەیە؟ ووتی چۆن ئەو كەسەی موخـەریب بێـت

مۆڵەتی پێ دەدرێت. منیش ووتم من موخەریب نیم، ئەگەر موخەریب بام ئێستا لێرە نەدەبووم، ئەگەر ئەوە بۆچوونتە من ڕازیم بە ئاشکرا بۆم بنووسە بۆیە ڕەزامەندیم لەسەر مەعامەلەکەی نەکردووە چونکە موخەریبە. کە وام ووت، ووتی من ناتوانتم ئەوەت بۆ بنووسم چونکە بەڵگەم بە دەستەوە نیە. منیش ووتم جا کەوایە ڕەزامەندیم بۆ بکە. بەم شێوەیە ڕەزامەندی لەسەر مەعامەلەکەم کردوو مۆڵەتی خوێندنم بە مووچەی تەواوە پێ درا.

## ویستیان سزام بدەن

لـە سـاڵی ١٩٧٩ فەرمانبـەر بـووم لەبەڕێوەبەرایـەتی هاوینەهـەوارەکانی پیرمامو بەرپرسی بەکرێدانی خانووەکانی گەشتو گوزاری بووم، یـەکێك لـەو کەسانەی خانووێکی لەلامان بەکرێ گرتبوو، بەڕێوەبەری فەرمانگەی مـەوادی ئینشـائی بـوو لـە هـەولێر، دوای چـۆڵکردنی خانووەکـە هاتـە لامـانو داوای وەرگرتنەوەی ئەو بڕە پارەیـەی کـرد کـە وەك تـەئمینات لێمـان وەرگرتبـوو. لەبەر ئەوەی هەندێ کەلو پەلی ناتەواو بـوو لەگـەڵ شـکاندنی هەنـدێ جـامی خانووەکـە، بۆیــە پارەکــەم پێــی نــەداوەو ئــەویش چــووە لای وەکیلــی بەڕێوەبەرەکــەمان (ع.ك.أ)و پارچــە کاغــەزێکی بــۆ هێنــام تیایــدا داوای بەخشینی ناوبراوی کردبوو لەو بڕە پارەیە. منیش ووتم ئـەو پارچـەکاغەزەی بۆ ببەوەو پێی بڵێ با خۆی پارەکەت لە جیاتی بدات چـونکە ئـەو دەسـەڵاتی ئـەوەی نیـە پیـاوەتی بـە مـاڵی حکومـەت بکـات. جـا ئـەوەبوو نـاوبراو بـە توورەییەوە گەڕایەوە لای وەکیلی بەڕێوەبەرەکەمانو دوای چەند دەقیقەیەك بەتەلــەفۆن قســەی لەگــەڵ کــردمو ووتــی وا نــاوبراو دەنێرمــەوە لات مــن بەڕێوەبەرتم دەبێ فەرمانەکەم جێبەجێ بکەیت؟ منیش ووتم ڕێـز لـە ئیمـزای خۆت بگرەو داوای شتی بێ قانوونیم لێ مەکە چونکە جێبەجێی ناکەم.

ئەوەی شایەنی باسە، دوای چەند ڕۆژێك سـەردانی دیـوانی ئەمینـدارێتی شارەوانیو هاوینەهەوارەکانم کردو لەوێ پێیان ڕاگەیاندم کە نیازیان وایە بـە سزا بۆ هاوینەهـەواری سەرسـەنگ بمگوازنـەوە. منـیش دوای دڵنیـابوونم لـەو بڕیارە، چوومە لای (نیـازی مـەلا غـەنی) سـکرتێری ئەمینـداری گشـتی شـێخ سوعاد حەبیب تاڵەبانی بوو، داوام لێی کرد چاوپێکەوتنی ئەمینـداری گشـتیم بۆ وەربگرێت. ووتی باشەو چووە ژوورەوەو پێی ڕاگەیانـد، بـەڵام ئەمینـداری گشـتی ڕەفـزی کـرد. منـیش لەبەرامبـەر ئـەم زوڵمـە خـۆم پێڕانـەگیراو بـەبێ مۆڵەتو بێ لە دەرگادان چوومە ژوورەوەو ووتم من ئەو کەسـەم کـە فـەرمانی

گواستنەوەی منت لەبەر دەست دایەو دەبیٚ گویٚم لیٚ بگریتو بزانی لەبەر چی دەمگوازیتەوە. بە توڕەییەوە پێی ووتم وا ئیمزای دەکەمو نامەویٚ گویٚم لە هیچیش بێت. منیش ووتم چۆن گویٚ ناگریت ئەی بەچی ئەمینداری گشتیت؟ ئەگەر گویٚم لیٚ نەگریت، فەرمانەکەت جێبەجیٚ ناکەم. ووتی بۆ تۆ چیت تا فەرمانی من جێبەجیٚ نەکەیت؟ ووتم تۆ ئەو پەڕی دەسەڵاتت ئیمزاکردنە لەسەر ئەو فەرمانە، بەڵام دەسەڵاتی من زیاترە لە هی تۆو فەرمانەکەت بە ئیمزاکەتەوە دەدڕێنم و ناچمو ئەو وەزیفەیەشم لە خوا دەویٚ نەك لە تۆ!! ، ئەمەندەم ووتو بە تووڕەیی هاتمە دەرەوەو گەڕامەوە شوێنی خۆم.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، دوای چەند ڕۆژێك خدر مەردان بەڕێوەبەری پشکنینی دیوانی ئەمینداریێتییەکەمان پەیوەندی پێوەکردمو ووتی تا ئێرە وەرە لێکۆڵینەوەیەکمان سەبارەت بە کێشەی تۆو (ع.ك.أ) هەیە. جا ئەوەبوو دوای وەرگرتنی ووتەی هەردووکمانو دوای لێکۆڵینەوە، ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەیان خستە بەردەمی ئەمینداری گشتیو ئەویش فەرمانی گواستنەوەی منی ڕاگرتو لە جیاتی من وەکیلی بەڕێوەبەرەکەمانی بۆ هەمان ئەو شوێنە گواستەوە کە نیازبوو منی بۆ بگوازنەوە.

## چۆن پەیوەندیم کرد بە پارتی پارێزگارانی کوردستان

دوای ڕاپەڕین کەش‌و هەوایەکی ئازادی وا هاتە ئاراوە زۆربەی کەسان یان چوونە ناو حزبە کوردستانیەکانی ئەوکات یانیش بوونە لایەنگیریان چونکە هیواو ئاواتێکی زۆریان بەو دروشمانەیان هەبوو کە هەڵیان گرتبوو، هەروەها بێبەشبوونی تاکی کورد لە ئینتیما کردن بۆ حزبێکی نیشتمانی‌و نەتەوەیی ڕاستەقینە لە پێش ڕاپەڕین، بەڵام من بیرکردنەوەیەکی جیاوازم هەبوو، حەزم نەدەکرد کاری سیاسی بکەم چونکە زۆر باوەڕم پێی نەبوو، بۆیە وێڕای ئەوەی پێشتر لە سەردەمی گەنجێتیمداو لە قۆناغی خوێندنی ئامادەیی بەرپرسی شانە بووم لە پارتی دیموکراتی کوردستان‌و تەنانەت لە دوای تێکچوونی دانووسانی پارتی لەگەڵ حکومەتی بەعس پەیوەندیم بە شۆڕشەوە کرد، هەرچەندە نەمتوانی تا کۆتایی لەگەڵیان بمێنمەوە، هەروەکو لەم یاداشتنامەیەمدا هۆکارەکەییم باس کردووە، جا دوای ڕاپەڕین بەرپرسی ڕێکخراوی پارێزەرانی پارتی (هادی ئیسماعیل) داوای لێکردم کە پەیوەندییان پێوە بکەم، بەڵام من سەرەڕای ئەوەی تا ئەو کاتەش لە ناخەوە خۆم بە پارتی دەزانی، بەڵام داواکەییم ڕەتکردەوەو پێم ووت من حەز لە کاری سیاسی ناکەم، بۆیە پێم باشە تەنها وەك لایەنگرو هەواداری ئێوە بمێنمەوە. جا ئەوەبوو بەڕێزیان زۆری لێ نەکردم‌و بیرۆکەکەی پێ باش بوو، هەر بۆیە دوو ساڵ لەسەر یەك ڕسووماتی نوێکردنەوەی ناسنامەی پارێزەرانی لەسەر ئەرکی پارتی بۆ نوێکردمەوە، بۆمن ئەوکاتە هاریکارییێکی باش بوو، چونکە ئیش‌و کارمان نەبوو، بە هۆی دوو گەمارۆی ئابووریشەوە باری داراییمان زۆر خراپ بوو، بۆیە قەت ئەو چاکەیەم لەبیر ناچێت.

دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی زۆر جارێکی ترپارێزەر (عبدالکریم هەمەوەندی ناسراو بە مامۆستا کاکە) بەرپرسی نوێی ڕێکخستنی پارێزەرانی پارتی هەمان داوای لێ کردم منیش هەمان وەڵامی پێشترم دایەوەو پێموووت

که بۆ منو بۆ ئێوەش باشترە تەنها بە لایەنگری بمێنمەوە. بەڕێزیشیان پێشنیارەکەی قبوڵکردمو زیاتر پێداگیری نەکردەوە.

ئیتر بەم شێوەیە بۆ ماوەیەکی زۆر دوور لە ئینتیمای سیاسی مامەوە، هەرچەندە چالاکی سیاسم هەبوو لە ڕێگەی بڵاوکردنەوەی بابەتی نەتەوەییو نیشتمانیو ڕەخنەگرتن لە ڕژێمی بەعسو بەشداریکردن لەو کۆڕو کۆبوونەوەسیاسیانەی بەرپرسەکانی ئەوکات بە گشتیو بەڕێزان مام جەلالو کاک مەسعود بارزانی دەیانبەست بۆ باسکردنی کێشە هەنوکەییەکانو تەنانەت لە هەر هەمووشیان گوزارشتم کردووە لە بیرو بۆچوونی خۆمو لە خەمو مەینەتییەکانی گەلەکەم دانەبڕابووم.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، ڕۆژێك چوومە بەڕێوەبەرێتی کاروباری ناوخۆ لە دیوانی پارێزگای هەولێرو نووسراوێکم پێشکەشکردن بۆ وەرگرتنی ئیجازەی کردنەوەی کۆمەڵەیەك بەناوی (کۆمەڵەی بەزەیی هاتنەوە بە ئاژەڵ) بەلام بەرپرسی ئەوکاتی بەڕێوەبەرێتی کاروباری کۆمەڵەو ڕێکخراوەکان لە دیوانی پارێزگا کە ئەفسەرێکی بە ڕەگەز عەرەب بوو کە سەر بە کۆنگرەی نیشتمانی ئەحمەد چەڵەبی بوو، ووتی بۆ لە عێراق مرۆڤ مافی هەیە تا بەدوای مافی ئاژەڵدابگەڕێین! ! ئیتر بەم شێوەیە ساردی کردمەوەو قەناعەتی پێ هێنامو منیش نووسراوەکەی خۆم کێشایەوەو تاکو ئێستاش قسەی ئەو کەسەم هەر لەمێشك دەزرینگێتەوەودەڵێم دەبێ کەی ئەو ڕۆژەبێت گشت مافەکانمان پارێزراو بێت تا بیر لە پاراستنی مافی ئاژەڵ بکەینەوە.

دوای تێپەڕبوونی سێ ساڵ، ڕژێك لە ژووری پارێزەرانی هەولێر پەیوەندییەکی تەلەفۆنیم بۆهات، کەچووم، دکتۆر خورشید ڕەواندوزی لەسەر هێڵ بوو، داوای لێکردم کە سەردانی بکەم لە بارەگای پارتی پارێزگارانی کوردستان. هەر ئەو ڕۆژە چووم، بارەگاکەیان لە خانوێك لە خانووەکانی گەڕەکی ئەمیندارەگشتییەکان بوو لە گەڕەکی بەلاشاوە. بارەگاکە بریتی بوو لە خانوێکی گەورە لە چەند ژوورێكو چێشتخانەیەك پێکهاتبوو، بەرەبەری

نیوەڕۆ بـوو بـۆنی گۆشـتی بـرژاو ئـەو نـاوەی تـەنیبۆوە. چـوومە لای دکتـۆر خورشـید، کەسـێکی لـەلا بـوو، پێـی ووت بـڕۆ چـایەکمان بـۆ بێنـە؟ ئـەویش ڕۆیشتو چای بۆ هێنامو لە شوێنی خۆی دانیشتەوە. دوایی دکتـۆر خورشـید ووتی من لێـرە سـکرتێری گشـتی حـزبمو ئـەوەش کـاك (ن.ڕ) بەرپرسـی لقـی پایتەختە. منیشی بەو ناساندو ووتی ئەوەش کۆنە قوتـابی خۆمـەو ئێسـتاش پارێزەرە. دواتر داوای لە (ن.ڕ) کرد کە بە تەنها بەجێمان بهێڵێ. ئیتر بە دوو قۆڵی ماینـەوەو باسـی پرۆگرامـی حزبـی بـۆ کـردمو ووتـی حەزدەکـەم تـۆش لەگـەڵم بیـتو بەیەکـەوەکار بـۆ زیندووکردنـەوەی پـڕۆژەی ویلایـەتی موسـڵ بکەین، کە لە بنەڕەتدا پڕۆژەی دامەزرانی دەوڵەتی کوردییە. لە ڕاستیدا بـەر لـەوەی وەڵامـی بدەمـەوە دوو شـت زۆر سـەرنجیان ڕاکێشـابووم، یەکـەمیان کێشت لێنانو برژاندنی گۆشتو بڵاوبوونـەوەی ئـەو بـۆنو بەرامـە بـوو بـەناو بارەگاکـەدا، دووەمیشـیان بۆچـی وەك خزمـەتکارێك مامەڵـەی لەگـەڵ (ن.ڕ) دەکرد، لە کاتێکدا کە ئەو بەرپرسی لقـی پایتـەخت بـوو. دکتـۆر لـە وەڵامـدا ووتـــی لـــە ڕاســـتیدا ئێـــرە دیوەخـــانی عومـــەراغای سورچـــییەو زۆربـــەی ئەوکەسـانەش کـە لێـرە کۆبوونەتـەوە پیـاوی ئـەونو دەبـێ بـەم شـێوەیە مامەڵـەیان لەگـەڵ بکـرێ دەنـا مـەغرور دەبن.منـیش ووتم جـا ئـەوە کـەی حزبایەتییـە. ووتـی تـۆ لـەوە بگـەڕێ گـرینگ ئەوەیـە ئێمـەبتوانین کـار بـۆ سەربەخۆیی کوردسـتان بکـەین. سـەبارەت بـە چێشـتلێنانەکەش ووتـی ئـەو خەڵکـەی لێـرە دەیـانبینی زۆربـەیان هـەژارو ڕەشو ڕووتـنو عومـەراغاش پیاوێکی نانده‌رو چاوتێرە بۆیە ئەم چێشتخانەی کردۆتەوە تا ئەو خەڵکە نان لێرە بخوات.

ئـەوەی ڕاسـتی بێـت لەبـەر دوو هـۆ داخوازیەکـەی دکتـۆرم قـەبوڵکرد، یەکـــەمیان زۆرم مەبەســـت بـــوو لـــە پڕۆژەیـــەکی وادا کاربکـــەمو خـــەونی چەندساڵەم لەڕێگای کەناڵێکی واوە بێنمە دی کە ئەویش دامەزرانی دەوڵـەتی کوردییە، دووەمیشـیان لەبـەر سـادەو سـاکاری حزبەکـە بـوو کـە بـە گۆتـەی دکتۆر خورشید دیوەخان بوو. جا بەو شێوەیە لەوێ مامەوە بێ ئەوەی بـزانم

شوێنم لە ئیعراب چی دەبێ، بەڵام کە سەری مانگ هات ووتیان سەردانی ژمێریار بکەو پاداشتی خۆت وەرگرە. کە چووم بڕی پێنج سەد دیناریيان دامێ و لەبەرامبەر ناوەکەشم نووسرابوو ئەندامی لقی پایتەخت.

لە ڕاستیدا ئەو بڕە پارەیە لەو قاتیو قووتیەدا بۆمن زۆر باش بوو بەشی خەرجی پانزە ڕۆژی دەکردین، هەروەها لەو ماوەیەدا لەوێ کۆمەڵێك کەسی ناودارم ناسی، لەوانە بەکر عبدالکریم حەوێزی زاوای مامجەلال کە ناسراوە بە ڕەئیس بەکرو یەکێك بوو لە گەورە ئەفسەرانی کۆماری مەهاباد، هەروەها عەقید وریای بایزاغای گەردیو سەدیق عەلی باویل ئاغاو سامی عەلی ئاغا. هەروەها لە میانی سەردانی کەسانێکی زۆر بۆ لای ئێمەو چوونەوەی ئێمەش بۆ لای ئەوان کەسانێکی زۆرم ناسیو بەبێ ئەوەی بمەوێ تێکەڵ بە سیاسەت بوومەوە، بەڵام ئیشو کارەکان بە سیستەماتیکی نەدەڕۆیشت بەرێوە بۆیە زۆر بێزار بووم، چەند جارێك لەگەڵ دکتۆر خورشید بە دوو قۆڵی باسی ئەوەمان لەلای یەکتر دەکرد، هەرچەندە ئەویش لەگەڵم هاوڕا بوو، بەڵام ئومێدی هەبوو کە باش بێت.

ئیتر بەم شێوەیە مامەوەو بوومە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی، هەرچەندە هیچ لە مەسەلەکە نەگۆڕابوو، چونکە هەر هەموومان ئەندامی سەرکردایەتی بووینو هەر هەمووشمان ئەندامی لقی پایتەخت بووین، جا بە حەقیقەت دیوەخان بوو نەك حیزب.

هەروەکو پێشتر باسم کرد، نیوەڕۆ سفرەی گەورەیان ڕادەخستو نانو چەشتێکی خۆشو بەلەزەت دەخورا، زۆر جاریش تکەو کەبابیان دەهێناو هەموومان وەکو خوشكو برا لەدەوری سفرەکە کۆ دەبووینەوەو نانمان بەیەکەوە دەخوارد.

بەم شێوەیە ماینەوە تا شەڕی نێوان پارتیو یەکێتی دەستی پێکرد، لە ئاکامی ئەو شەڕەنەگریسەدا میللەتی کورد بەسەر خۆیدا دابەش بوو، پارتە سیاسیەکانی کوردستان بە شێوەیەکی گشتی دابەش بوون بۆ دوو بەرە، هەریەکێکیان پشتگیری یەکێك لەو دوو لایەنە شەڕکەرەی دەکرد، تەنانەت

لـەناو خـودی هـەر حـزبێکیش ئەندامـەکان دابـەش بووبـوون بـۆ دوو بـەرەو هەریەکەیان لایەنگیری لایەنێك بوو، ئەمەش وایکرد ئیشکردن لەو حزبانـە زۆر ناخۆش‌و مەترسیدار بێت.

پارتی کرێکارانی کوردستانیش ناکۆکی هەبوو لەگـەڵ پـارتی دیمـوکراتی کوردستان‌و لەگەڵی لە حاڵەتی شەڕدابوو. پـارتی پارێزگـارانی کوردسـتانیش لەبەر ئەوەی پـارتێکی سـەربەخۆو بێلایـەن بـوو، هـەروەها هـیچ دەزگایـەکی زانیاریشی نەبوو کە زانیاری لەسەر کەسەکان‌و ڕووداوەکان کۆبکاتەوە، بۆیـە زیـاتر لـە حزبـە کوردسـتانیەکانی تـر مەترسـی تێـوەگلانی لـە شـەڕی نێـوان پارتی‌و یەکێتی لێ دەکرا. تەنانەت جارێك لە دانیشـتنێکمان بـە سـەرۆکایەتی نەجم عومەر سورچی‌و نـەجات عومـەر سورچـی‌و مـن‌و (ن.پ)و (م.ی) (م.ج) لەگـەڵ مـام جـەلال لـە مەکتـەبی سـکرتاریەت بـۆ گفتوگـۆکردن لـەبارەی پتـەوکردنی پەیوەندییـەکانمان لەگـەڵ یـەکتر، ئەنـدامێکی سـەرکردایەتیمان ڕووی لەمام جـەلال کـردو پێـی ووت مـام جـەلال بـۆ لەگـەڵ ئێمـە ڕێککـەوتن ناکـــەن بـــۆ پەیوەنـــدی دوو قـــۆڵی، خۆتـــان دەزانـــن عومـــەراغا ســـەرۆك عەشیرەتێکی گەورەیەو گوندی کەڵەکینیش شوێنێکی جوگرافیـای سـتراتیژی هەیـە کـە بـۆ ئێـوە زۆر بـە سـوودە. مـام جـەلال فـایلێکی لـە چـەکمەجەی مێزەکەی بەر دەمی دەرهێناو ووتی دیارە تۆ ئاگات لە هیچ نیە! دەستی بـۆ دکتۆر فوئاد مەعسوم درێژکردوو درێـژەی بـە قسـەکانیداو ووتـی ئێمـە چـەند دانیشتنێکمان لەگـەڵ عومـەراغا کـردووە بـۆ ئـەم ڕێککەوتنـە، دکتـۆر فوئـاد دەزانێ ئێمـە وەکـو یـەکێتی ڕازیـن‌و ڕێکەوتنەکـەشمان ئامـادەکردووە بـەڵام نازانین بۆ عومەراغا ئیمزای لەسەر ناکات.

بەهەرحاڵ، هەر لەو ماوەیەدا هەمان شـاند سـەردانی مەکتـەبی سیاسـی پارتی دیموکراتی کوردسـتانمان کـردو لەگـەڵ سـامی عبـدالرحمن‌و فەڕەنسـۆ هەریری دانیشتین‌و باسمـان لـە پتـەوکردنی پەیوەندییـەکانی نێوانمـان کـرد. هەر لەمیانی ئەو دانیشـتنەدا سـامی عبـدالرحمن ڕووی لـە نـەجم کـردو ووتـی ئێوە لەلایەك بـاس لـە بـەهێزکردنی پەیوەنـدیی نێوانمـان دەکـەن‌و لەلایـەکی

تـریش زەیـدی براتـان بـە ئـامێرێکی بێتـەل لـە گونـدی کەڵەکینـەوە زانیـاری لەسەر جموجـۆڵی ئێمـە دەداتـە یـەکێتی. هەرچـەندە نـەجم ئـەو تۆمەتانـەی ڕەتکـردەوە، بـەڵام سـامی عبـدالرحمنو فەڕەنسـۆ هـەریری قەناعـەتیان پـێ نەهات.

بەم شێوەیە، پەیوەندیمان لەگەڵ هەردوو پارتی دەسـەڵاتدار (یـەکێتیو پارتی) وەکو پێویسـت نـەبوو، چـونکە عەمـەراغا بـە تـەواوی خـۆی یـەکلایی نەکردبۆوە. جـا لـەم کـەشو هـەوا ئـاڵۆزەدا، ڕاگرتنـی بـەڵانس بـە یەکسـانی شــتێکی ئاســان نــەبوو، بۆیــە ڕۆژێــك بــەئامادەبوونی (ع.س) ئەنــدامی سەرکردایەتی لەگەڵ نەجات عومەر سورچی دانیشتمو مەترسـییەکانی شـەڕی پارتیو یەکێتیم بۆسەر حیزبەکەی خۆمـان خسـتەڕووو پـێم ووت ئاسـان نیـە گونـدی ئێـوە لەناوجەرگـەی ناوچـەی دەسـەڵاتی پـارتی بێـتو بارەگـای حزبیشتان لە ناوچەی دەسەڵاتی یەکێتی بێتو لەو نێوەشدا هاتووچۆ بکەنو بشـتوانن بێلایـەنی خۆتـان بپـارێزن. بۆیـە پێشـنیارم کـرد کـە خۆیـان یـەکلا بکەنەوە تا ئێمەش بتوانین خۆمان یەکلا بکەینەوە چی بـە مانـەوە یـانیش بـە وازهێنان لە حزب، تەنانەت من پێشەکی ڕای خۆمم پێی ووتو گوتم من هەر لە ئێسـتاوە دەست لەکار دەکێشمەوەو خـەریکی پـارێزەری دەبم. ئـیتر بـەو شـێوەیە نـە ئـەوان بـە قسەی منیان کردو نەمنیش لەگەڵیان مامەوە.

ماوەیــەك دانیشــتم، عومــەراغا زۆر هەوڵیــدا لــە بڕیارەکــەم پەشــیمانم بکاتەوەو بۆ ئەم مەبەستە یەك دوو جـار بەتـەنها لەگـەڵم دانیشـت بـەڵام مـن لەبڕیاری خۆم پاشگەزنەبوومەوە. دوای ئەوەی چـوومەوە سـەر کـاری خـۆمو خەریکی پیشـەی پـارێزەری بـووم، ڕۆژێـك کۆسـرەت ڕەسـوول کـە سـەرۆکی حکومەت بوو، دکتۆر محەمەد سابیری بەرپرسی کۆمیتەی زانکۆی یەکێتی بـە قاسـید نـاردەلامو داوای لێکـردم کـە سـەردانی بکـەم. منـیش دەمزانـی بـۆ دەیەوێ بمبینێ، بۆیە ڕەتم کردەوە کە بچمەلای. بۆ ڕۆژی دواتر جـارێکی تـر ناوبراو هاتەوە لامو ووتی کاك کۆسرەت ڕێزی بـۆت هەیـە زۆری پـێ ناخۆشـە کە وازت لە پارتی پارێزگارانی کوردستان هێناوەو دەڵـێ پـێم بـاش بـوو وەك

ڕۆشنبیرێك لەگەڵ عومەراغا بمێنێتەوە تا بتوانێ یارمـەتی بـدات بـۆ خزمـەتی کوردستان. بەڵام جەنابیان پێی باشە دانەنیشیتو لە نووسینگەی مافی مرۆڤ وەك یاریدەدەری مامۆستا گۆران لە یەكێتی نیشتمانی کوردستان کاربکەیت. منیش ووتم من هۆکاری خۆم هەیە کە وازم لە پـارتی پارێزگـارانی کوردسـتان هێناوە، لەبەر هەمان هۆکاریش نامەوێ ئەم پۆستە قبولٚ بکەم.

هەرچـەندە دواتـر لـە سـاڵی ١٩٩٦ لەسـەر داوای پرۆفیسـۆر سـەعدی بەرزنجیـەوە پەیوەنـدیم بـە پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتانەوە کـردەوەو تـا ئێسـتاش بـەردەوامو هەنـدێك پلـی حـزبیم تیـا بینیـوە لەوانـە ئەنـدامی نوسینگەی (ناوچەی زانکۆ) لە ساڵی ٢٠١٠ بوومە ئەندامی کۆنگرەی سیانزەو بەشـداربووم لـە نووسـینەوەی پێـڕەوو پرۆگرامـی حـزبو لەگـەڵ تیمێـك بەسەرپەرشـتی مامۆسـتا مـەحموود محەمـەد ئەنـدامی مەکتـەبی سیاسـی (پ.د.ك) بۆ ماوەی زیاتر لە ١٢٠ کاتـژمێر ئیشـمان تیـا کـرد تـا گەڵاڵـە بـوو، ئینجا پێشکەشی کۆنگرەمان کردو تەنانەت لەناو کـۆنگرەش ئەنـدامی هـەمان لێژنە بووم و داکۆکیەکی زۆرم لەو بیرو بۆچـوونانە کـردەوە کـە پێشـتر ئێمـە لەسەری ڕێك کەوتبوون. ئێستاش ئەندامی دەستەی ڕاوێـژکاریم لـە مەکتـەبی سیاسـیو زۆرجـاریش لـە نووسـینگەی بـەڕێز نێچـیرڤان بـارزانی بـیرو ڕام وەردەگیرێت لەسەر ڕووداوو پێشهاتە سیاسییەکان.

لە ڕاستیدا هۆکاری سەرەکیم لە پەیوەنـدیکردن بـە پـارتی پارێزگـارانی کوردستانەوە بە پلەی یەکەم نەمویست دڵی دکتۆر خورشید ڕواندزی بشکێنم چونکە زۆرم خۆش دەویستو پێم وابوو هەر بڕیارێك ئەو بیـدات تەندروسـتە، کەچـی بەداخـەوە دواتـر بـۆم دەرکـەوت ئـەویش بـە هەڵـەدا چـووبوو لـە بەدواکـەوتنی ئـەو دروشمـە بریقەدارانـەی ئـەو حزبـە بـەرزی کردبوونـەوە (مەبەستم سەربەخۆیی..مافی مرۆڤ..دیموکراسی)ە چـونکە هـیچ کـاری جـدی بۆ نـەکراو بۆیـە دکتـۆر خورشـیدیش حزبـی بـەجێ هێشـتو بـەرەو سویسـرا ئۆغری کردو تاكو ئێستاش بە پەنابـەری سیاسـی لـەوێ ماوەتەوە.ئێسـتاش هەر جارێك دکتۆر خورشید ببینم پێی دەڵێم ئەگـەر تـۆ نەچـووبایتە نـاو ئـەو منیش ئەم زیانەم نەدەکردو ئێستا پەشیمان نەدەبووم.

## گەشتی یەکەم جارم بۆ ئێران و
## دیدارم لەگەڵ ڕاوێژکاری ڕەفسە نجانی

نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی کاتژمێردووی دوای نیوەڕۆ ڕێکەوتی ١٩٩٦/٦/٦ لەسەر دەعوەتی حکومەتی کۆماری ئیسلامی ئێران شاندێکی پارتی پارێزگارانی کوردستان بە سەرۆکایەتی عومەراغای سورچی و ئەندامێتی من و نەجم سورچی و عەقیدی مافپەروەر محی الدین ناسراو بە ئەبوو دیار بەمێوانداری چوینە تاران و لە هوتێل کەوسەر دابەزین و دوای پشوودانێکی کورت دوای نوێژی شێوان لەلایەن ئاغای مەحەمەدی ڕاوێژکاری سەرۆك کۆماری ئێران بانگێشت کراین و چوینە ئۆفیسەکەی کە لە بناری شاخێکدابوو لە تاران . باس لە دروستکردنی پەیوەندی کرا لە نێوان ئێمە وەکو پارتی پارێزگارانی کوردستان و حکومەتی ئێران، هەر لەمیانی ئەو دیدارەدا ژمارەیەکی ڕۆژنامەی سەربەخۆییم دایە کە من سەرنووسەری بووم، دروشمەکانی ئەو ڕۆژنامەیە سەرنجی ئاغای مەحەمەدی ڕاکێشاو ووتی ئێوە دەمێکە باس لە یەکپارچەیی خاکی عێراق دەکەن کەچی ڕۆژنامەکەتان بەناوی سەربەخۆییە و ئامانجی سەربەخۆبوونی کوردستانی گەورەیە. هەروەها لەو دیدارەدا من پرسیارێکم ئاراستەی ئاغای مەحەمەدی کردو پێم ووت ئایا ئێوە دەزانن کە ئەمریکا پلانی هەیە بۆ ڕوخاندنی ئێوە؟ ئایا ئێوە چ پلانێکتان هەیە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی؟ لە وەڵامدا ڕاوێژکاری ڕەفسەنجانی ووتی: ئێمە زۆر لە مێژە هەستمان بە هەڕەشەی ئەمریکا کردووەو پشت ئەستوورین بە دۆست و لایەنگرانمان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە لە ئێستادا پەیوەندیمان لەگەڵ زیاتر لە سێسەد حزب و ڕێکخراوی سیاسی لەو ناوچەیە هەیە لە نێوانیاندا عێراق و ئەو شوێنەی کە ئێوە لێوەی هاتوون. دەزانن هەژموونی ئێمە لە کوردستان لە هەژموونی ئەمریکا زیاترە هەر بۆ نموونە، هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان زۆریان نەمابوو بارەگای سەرەکی

پارتی دیموکراتی کوردستان بگرن، بەڵام ئێمە داوامان لە مام جەلال کرد کە هێزەکانی لەو ناوچەیە بکشێنێتەوەو پەلاماری بارەگای سەرەکی پارتی نەداتو ئەویش بە قسەی کردین.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، لەو کۆبوونەوەیەدا عومەراغای سورچی داوای یارمەتی دارایی لە ئاغای مەحەمەدی کرد بەڵام ئەو ئەم داوایەی ڕەتکردەوەو ووتی ئێمە تەنها یارمەتی بازرگانیو مەشقپێکردنی چەکدارەکانتان پێشکەش دەکەین. منیش ووتم پێم باشە قووتابیەکانمان ئەوانەی دەرچووی زانکۆن کورسی خوێندنیان بۆ تەرخان بکرێ تا خوێندنی باڵا لە ئێران تەواو بکەن، ئەمە بۆ هەردوولامان باشە، ئێمە لە عێراقدا لەلایەن ڕژێمەوە گەمارۆمان خراوەتە سەرو دەرفەتی خوێندن بۆ قوتابیەکانمان لەزانکۆکانی عێراق نیە، بۆیە قوتابیەکانمان سوود لەم دەرفەتە وەردەگرن، لە هەمان کاتیشدا ئەو قوتابیانەی بۆ خوێندن ڕوو لێرە دەکەن سوود لە سەرچاوە هزریەکانی شۆڕشی ئێران وەردەگرنو ئەم ئەفکارانە بۆ چینی ڕۆشنبیری کوردستان دەگوێزنەوە بەمەش ئێوە وەك کۆماری ئیسلامی ئێران سوودمەند دەبن. بەداخەوە ئاغای مەحەمەدی ئەم داوایەی منی ڕەت کردەوەو ووتی ئێمە کورسی خوێندنمان تەنها بۆ قوتابیانی خۆمانەو ناتوانین بیدەین بە ئێوە، ئێمە تەنها پەیوەندیمان لەگەڵ ئێوە نیە، بەڵکو پەیوەندیمان لەگەڵ زیاتر لە سێسەد حزبو ڕێکخراوی سیاسیە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست جا ئەگەر تەنها دوو کورسی بۆ هەر یەکێك لەو ڕێکخراوانە تەرخان بکەین ئەوا بەشی قوتابیانی خۆمان ناکات.

هەر لەو گەشتەدا، لە هوتێل کەوسەر لەگەڵ مامۆستا عەلی باپیر یەکترمان ناسی، ئەویش لەسەر دەعوەتی کۆماری ئێران هاتبوو لە هەمان هۆتێل دابەزی بوو. ئەو چەند ڕۆژەی لە تاران ماینەوە زۆربەی کات لەگەڵ عومەرئاغا لە ژوورەکەی بەیەکەوە دادەنیشتین یان پیاسەمان دەکرد لە

خیابـانی وەلی عەسـر، یادەوەریـەکانی خـۆی بـۆ دەگێڕامـەوە، ئـەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام، گێڕایەوە ووتی لە ساڵی ١٩٧٤ من رەئیس فرسـان بـووم‌و مانگی جارەك لە وەزارەتی دیفاعی عێراقی کۆبوونەوەم لەگەڵ وەزیری دیفاع دەکردو بە کۆپتەر پارەیـان بـۆ دەناردمـە گونـدی، مخـەوەلیان کردبـووم بـە پارە ئەو چیایانەیان بۆ بکڕمەوە، منیش کاغەزم دەنارد لـۆ مەسـئولەکانیان، جا ئەوەی زۆر تەئسیری تێکردم جوابی عیزەتی سولێمان بـەگ بـوو لـۆ مـن، پارەکی زۆرم عەرز کردبوو کە چیای هەندرێنمان بـەبێ شـەڕ تەسـلیم بکـات. بەلاَم ئەو جـوامێرە جـوابی لـۆ ناردمـەوەو گـۆتی مـن لـۆ خیانـەتێ نەبوویمـە پێشـمەرگە، خۆزگـا فیشـەکەکت لـۆ بناردبـام خـۆم پـێ بکوشـتبا بـەس ئـەو داوایەت لێ نەکردبام.

کە عومەرئاغا ئـەوەی بـۆ گێڕامـەوە پـێم ووت عومـەرئاغا تـۆ چـیتکرد؟ ووتی منیش لە کۆبوونەوەم لەگەڵ وەزیری دیفاع ئەوەم لۆی گێڕایەوەو گـۆتم ئەوە بە حەراری لە داكو بابی خۆی بووە حەیفە مرۆیێوەهـا مـەرد بکوژرێـو گۆتشم من لە هیچ هجومەکی لۆسەر ئەو پیاوەی بەشدار نابم.

ئێوارەی رۆژی هـەینی رێکـەوتی ١٩٩٦/٦/١٤کاتـژمێری شەشـی ئێـوارە گەیشتینە هەمەدان. کە پڕە لەمەزارگەی پیاو ماقوڵان و ناوداران و شـاعیرانی مــەزن و تاڤگــەی بــەرزو شــوێنەواری مێــژوویی .ئــەم شــارەی باباتــاهیری هەمــەدانی و ئــیبن ســینای تیاژیـاوەو وەسـیەتە مێژووییەکـەی داریـۆش بـە خەتیبزماری لەسەر چیاکانیدا هەڵکۆڵدراوە .....

دوای پشوودانێکی کـورت لەبـەر جـوانی و رازاوەیـی ئـەم شـارە خۆمـان پێنـەگیراو گەشـتێکمان بـەناو بـازارو مەزارگـەی پیـاو چـاکان و نـاوداران و شوێنەوارەکۆنەکان و ناوچە گەشتوگوزاریەکانیدا کرد .

خەڵکی ئەم شارە ژن و پیاو وپیرووجاحێڵ و منداڵو هەرزەکار بە ماشێن و ماتۆر سیکل و پیادە ڕژابوونە ناو شارو باخچەگشتیەکان و ژێردارو درەختە

بالإبەرزە قەشەنگەکان و لەهەموو راستێکەوە لێی راکشابوون ...لە وێ تـازە لە سەرەتای بەهاری لای خۆمانی دەکرد ...سـەماوەریان لێـی داگیرسـاندبوو و مەقارەی رەژوویان گەش کردبوو لەلایەك فرەفـرێ چـایەو لەلایـەکیتر بـۆن کرووزی گۆشتی برژاو و قرتە قرتی برێشکەو چەرەزات و فستق دەهات .

سەرەتا رومان کردە تاقگـەی هەمـەدان ، ئـەم تاقگەیـە زۆر لـە تاقگـەی گەلی عەلیبەگ بەرزترو دلڕفێنتر بوو. بـۆ ڕۆژی دواتـریش چووینەئەشـکەوتی عەلی سەدر کە بەڕاسـتی دلـڕفێن بـوو، یەکـەم جـارم بـوو دەریاچـەیەك لـەناو ئەشکەوتێکدا لە قولایی زەوی ببینم.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، لە گۆڤاری هـەریم ژمـارە (٢٣٠) ی ١٠/٨/١٩٩٨ بابــەتێکم لەســەر ئــەو ئەشــکەوتە بلاوکــردەوە کــە ئەمــەی خــوارەوە دەقەکەیەتی: (( دەریاچەی نێو ئەشکەوتەکە.....گەشتێك بەنێو ئەشـکەوتی عەلی سەدردا: لە میانی گەشتێکدا بۆ ئێران چـووینە شـاری دێرینـی هەمـەدان کە یەکێکە لەو شەش شـارە ئێرانیـەی کـە بەناوبانگـە بـە ڕواڵەتـە مێـژوویی‌و سروشتییە سەرنج ڕاکێشەکەی لە وەرزی هاویناندا هاوینەخۆرو گەشتیاران بۆ لای خۆیان کێش دەکات.

شاری هەمەدان پێش سێ هەزار ساڵ لەسەر کێوی ئەلوەنـد دامـەزراوەو هیرۆدۆتسی مێـژوونووس لەمبارەیـەوە دەڵـێ: ((هەمـەدان یەکـەم پایتـەختی پاشای میدییەکان بووە)) لـە هەمەدانـدا پاشمـاوەی شـێرەبەردەکەو مـەزاری بابا تاهیری هەمەدانی‌و ئیبن سیناو عارف نامی شاعیرو دەیانی تری لێیە. لـە هەمووشیان گرینگترو سەرنج ڕاکێشتر ئەشکەوتی عەلی سەدرە کـە دەکەوێتـە قولایی هەنـدێك گردۆڵکـەی نزمـەوە کـە بـە گردۆڵکـەکانی (کابوتـار ئاهـەنگ) ناسـراون‌و دەکەوێتـە بـاکوری ڕۆژئـاوای شـاری هەمـەدان‌و بـە حـەفتاو پێـنج کیلۆمەتر لێیەوە دوورە.

شایەنی ئاماژەبۆكردنە، ئەوەی جارێك چاوی پێ بكەوێ هەتا دووبارەی نەكاتەوە دڵی داناكەوێ.

ئەشكەوتی عەلی سەدر كە یەكێكە لە ناوچە دەگمەنەكان لە جیهاندا دەكەوێتە ژێر بەرزاییەكانی (ساری غایە) لەسەر هێڵی درێژی (٤٨)و پانی (٣٥) پلەو لە بەرزی (٢١٠٠) مەتر لەسەر ئاستی دەریاوە.

ئەم زانیاریانە وای لەو كەسانە كرد كە بە شاخدا هەڵدەگەڕانو لە ساڵی ١٩٦٢ ئەم شوێنە بدۆزنەوە هەروەها كرداری دۆزینەوە لەساڵی ١٩٦٧ دووبارە دەستی پێ كردەوەو توانرا گەلێك كونو كەلەبەری تر لەم ئەشكەوتە بدۆزرێتەوەو سەرنجی دەزگاكانی ڕاگەیاندنی ئێرانیو جیهانی بۆخۆی ڕابكێشێ لە ڕووی جیۆلۆجیەوە ئەم ئەشكەوتە دەكەوێتە نێوان (سنە)و (سیدجان) و زنجیرە چیای زاگرۆس.

پێكهاتەكانی ئەشكەوتەكە دەگەڕێتەوە بۆ نیشتەكان (ترسبات) ی چاخی جوراسی ١٥٠ ملیۆن ساڵ پێش ئێستا. ئەشكەوتەكە لەناوەوە گەلێك بەرزیو نزمی تیایە كە بە درێژایی چاخەكانو لە ئەنجامی گۆڕانی ئاووهەواو كردارە كیمیاییە یەك لەدوایەكەكان دروست بووە.

لە ناوەوەی ئەشكەوتەكە دەریاچەیەك هەیە، ڕوونو ئاشكرایەكە بوونی چەندین جۆرە كانزاو كەرەستە كیمیاییەكان لەو ئەشكەوتەدا جۆرە ڕەنگێك دەبەخشێتە ئاوی ناو ئەشكەوتەكە كە كاربۆناتو بیكاربۆناتی تیایە هەروەها جوانیەك بە ئەشكەوتەكە دەبەخشێت.

سەرچاوەی ئاوی ئەو دەریاچەیە ئاوی بارانە بۆیە كەمیو زۆری ئەو ئاوە دەبێتە هۆی گۆڕانی بەرزی ئاستی ئاوەكە لە نێوان نیو مەتر تا مەترێك ساڵانە.

هیچ بوونەوەرێكی زیندوو لەناو ئاوەكەدا نیە لەبەرئەوەی هیچ ڕووناكی یەكی سروشتی لەناو ئەشكەوتەكەدا نیە هەروەها لەبەرئەوەی جۆرەها خوێ لەناو ئاوەكەدا هەیە.

ئاوی ئەشکەوتەکە زۆر ڕۆن و جوانە بە چەشنێك مرۆڤ بەچاوی ئاسایی قولآیی دەمەتری دەبینیێ.

لە ئەنجامی کەوتنی نیشتەنی لە بنمێچی ئەشکەوت و دیوارەکانی بۆ ناو ئاوەکە، قولآیی ئاوەکە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك لە سفرەوە بۆ ١٤ مەتر دەگۆڕیێ، ئاووهەوای ناو ئەشکەوتەکە هەمیشە شێدارەو هەواش لە ناوەوەی ئەشکەوتەکەدا جێگیرە بە جۆرێك ئەگەر موومێك دابگیرسێنیت زۆر کەم هەست بە جولآنەوەی ئاگرەکەی دەکەی. ئەم ئەشکەوتە بە یەکێك لە گرینگترین شوێنە جوگرافیای یەکانی هەمەدان دەژمێردرێت کە ژمارەیەکی زۆری گەشتیاران لە ناوەوەو دەرەوەی ئێران گەشتی بۆ دەکەن.

گەشتکردن لە هەمەدانەوە بۆ ئەویێ بە ئوتۆمبێل یەك کاتژمێر دەخایەنیێ و گەشتیاران دەتوانن لە دوو ڕێگای سەرەکییەوە بچنە هەمەدان، یەکەمیان لە تارانەوە بە ماوەی (١١٠) کیلۆمەترو ئەوەی تریشیان لە کرماشانەوە لە دوریانی سالْح ئابادەوە بە ماوەی (٧٣) کیلۆمەتر.

گەشتیاران تاموچێژێکی زۆر لە بەرزیو نزمیو دوورگەکانی ناو ئەشکەوتەکە وەردەگرن لە کاتی سوڕانەوەیان بە نێو کون و کەلەبەرەکانی ناو ئەشکەوتەکە، هەروەها خۆشیەکی زۆر وەردەگرن لە سواربوونی بەلەمە بچکۆلانەکانی ناو دەریاچەکە.

شایەنی باسە، نزیکەی بیست بەلەمی ڕەنگاو ڕەنگ لەناو ئەو دەریاچەی ناو ئەشکەوتەکە گەشت بە گەشتیاران دەکەن و خولانەوە بەناو گشت کون و کەلەبەرێکی ئەو ئەشکەوتە بە بەلەمی دەست نزیکەی کاتژمێرێك دەخایەنیێ. هەروەها لە دەرەوەی ئەشکەوتەکەش مێوانخانەو چێشتخانەو شوێنی ڕاوەستانی ئوتومبێل و باخچەی مندالآن و هۆیەکانی گواستنەوەو گەیاندن هەیە.

لەکۆتاییدا زۆر سوپاسی حەسەن سەمین پوری بەڕێوەبەری دامودەزگا گەشت و گوزاریەکانی ئەشکەوتی عەلی سەدر دەکەم کە یاوەرمان بوو لەم گەشتەداو سوودێکی زۆرم لە زانیارییەکانی وەرگرت)).

دوای ئـەوەی گەڕاینـەوە هۆتێـل پشـووێکی کورتمـان داو دوایـی بـە پـێ بەرەو مەزاری بابا تاهیری هەمەدانو ئیبن سینا ڕۆیشتین.

مـەزاری باباتـاهیری هەمـەدانی لـە نزیکـی دەروازەی بـاکووری شـاری هەمەدان لە شەقامی تارانەوە، لە کۆتایی شەقامی بابا تـاهیرو لـە مەیـدانێکی بە هەمان ناودایە کە لە ساڵی ١٩٦٩ی زایینی تازەکراوەتەوە.

باباتاهیر یەکێکە لـە عارفـە گـەورەکانی ئـەهلی حـەق (نیـوەی یەکـەمی سەدەی پێنجەم)و لەئەولیای ناسراوی ئەو دەستەیە ژمێردراوە کـە زنجـیرەی عارفەکانی سەرزەمینی شاخاوی ئێـران وەکـو (عـین القچـات) ی هەمـەدانیش پێوەیان لکاون.

گۆرانیەکانی یان چامەکانی باباتاهیر وشە کورتـەکانی ئـەو لـە بنەڕەتـدا بەزمانی پەهلـەوی، لـوڕی، کـوردیو هەمەدانیـە کـە بـە درێـژایی کـات وەکـو ئێسـتای لێ دەرهـاتووە. ئەمـەی خـوارەوە نموونەیەکـە لـەو چـوارینانەی باباتاهیر کە لە ناوەوەی مەزارەکەی لەسەر بەردی مەڕ مەڕ هەڵکۆڵدراوە:

**((زدست دیدەو دل هر دو فریاد**

**کە هرچە دیدە بیند دل کند یاد**

**بسازم خنجری تیشش زفولاد**

**رنم بر دیدە تا دل گردد ازاد**

**ماناکەی بە زمانی کوردی:**

**لە دەستی دیدەو دڵ هەردوو مەداد**

**کە مەرچی دیدە ببینێ دڵ دەیکایاد**

**دەسازم خەنجەرێك نوکی لە پۆڵا**

**دەیدەم لە دیدە تا دڵ بێت ئازاد))**.

دوا وێستگەمان سەردانی مەزاری ئیبن سینابوو. ئـەو مـەزارە دەکەوێتـە ناو جەرگەی بازاڕی هەمەدانو لەبەشی پێشەوەی مەزارەکە ژووری پێشـوازی

مێوانان هەڵکەوتووەو هەر لەوێ ڕێبەرێکی مێژوویی دروستکردنی ئەو مەزارە بە مێوانان دەبەخشرێو لە لایەکی تریش جامخانەیەکی لێیەو تیایدا کۆمەڵێك وێنەی فۆتۆگرافی مێژووی تایبەت بە شوێنەوارە مێژووییەکانی شاری هەمەدان نمایش کراوە. ئەوەی ئارەزووی کڕینیان بکات بە نرخێکی گونجاو دەتوانێ بیانکڕێ. هەروەها لەبەرامبەر مەزارەکەش هۆڵێکی گەورە هەیە کە بریتیە لە بەشی زۆری دەستنووس‌و بلاّوکراوەکانی ئیبن سینا کە خۆی لە نزیکەی سەدان دەستنووس‌و نووسراوو بلاّوکراوەی پزیشکی‌و زانستی دەدات. شایەنی ووتنە، مەزاری ئیبن سینا دوای ئەوەی چەند جارێك گۆڕانکاری تیا کراوەو نۆژەن کراوەتەوە لە گۆڕستانی (شمس المعالی) کە ناسراوە بە (گنید کابوس)، دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پانزەهەمی زایینی کە مێژوویترین‌و کۆنترین تەلاری ئیسلامی ئێرانە. مەزاری ئیبن سینا بە یەکێك پڕشکۆترین شوێنەواری بیناسازی ئێرانی دەژمێردرێ. ئەو کەلە دنیای ڕۆژئاوادا بە ناوی avicennaناسراوە یەکێکە لە هەرە بەناوبانگەکانی فەلسەفەو پزیشکی ئێران‌و جیهانی ئیسلامی.

لە ساڵی (٣٧٠) ی کۆچی هەتاوی لە (خرمیشن بخارا) لە دایك بووەو لە ساڵی (٤٢٨) ی کۆچی هەتاوی لە هەمەدان کۆچی دوایی کردووەو هەر لەوێش بەخاك سپێردراوە.

لەساڵی (١٣٣٢) کۆچی هەتاوی دا مەزاری ئیبن سینا نوێ کراوەتەوە کە هاوکاتە لەگەڵ جەژنی هەزارەمینی ئەم فەیلەسوفە نەمرە. شایەنی ئاماژەبۆکردنە، لەلای چەپی مەزارەکەوە گۆڕی (ئەبو سەعیدی دەخدوك) ی لێیە. هەروەها مەزاری ئیبن سینا نزیکەی (٥٠٠٠) دانە کتێبی تێدایە لەگەڵ دەستنووسەکانی. لە حەوشەی مەزارەکەدا گۆڕی (عارف قەزوینی) شاعیری هاوچەرخی تێدایە.

## گەشتی دووەم چارم بۆ ئیران و دیدارم لەگەڵ شیخ ئەدهەم بارزانی و شیخ ئەیوب بارزانی

له۱۹۹۷/۹/۲۷ لەسەر دەعوەتی شێخ ئەدهەم بارزانی من و مامۆستا شێخ حوسێن بالیسانی له ڕێگای حاجی ئۆمەرانەوە چووینە ئێران . سەرەتا چووینە خانێ و لەوێوەش بۆ نەغەدە کە ماڵی شێخ ئەدهەمی لێ بوو .

شایەنی باسە کە گەیشتینە حاجی ئۆمەران بەسەر شەڕی نێوان پارتی کرێکارانی کوردستان و حزب الله شۆرشگێڕی کورد چووین ، ئەوەبوو سەرلە بەیانی بوو لە پێکدادانێکدا چوار چەکداری یەکەکەیان کوشتبوو یەکێك لە کوژراوەکان ئافرەت بوو . چەکدارەکانی شێخ ئەدهەم بە سەرسوڕمانەوە چیرۆکی شەهیدبوونی ئەو ئافرەتە گەریلایەیان بۆ ئێمە گێڕایەوەو دەیانووت دوای ئەوەی ئەو سێ گەریلا پیاوەمان کوشت، تەنها ئەو گەریلا ئافرەتە مابۆوە، نەماندەویست بیکوژین چونکە لەشەڕکردنەکەیدا دیاربوو زۆر ئازاو بە جەرگ بوو، بۆیە پێمان حەیف بوو کەسێکی وا ئازا بکوژرێت، بەلاّم وێڕای ئەوەی دەنگماندا کە خۆی بدات بە دەستەوەو هیچی لێناکەین، بەلاّم ئەو بەردەوام بوو لە شەڕکردن هەتا دوا فیشەك کە پێی مابوو. کاتێك کە زانیمان هیچ فیشەکی پێ نەماوەو دەنگی تەقەی بڕا، چوینە سەری بینیمان خۆی بە پارچە پەتێك لەو دار تەڕاشە بەستبۆوە کە تەقەی لەژێریەوە دەکردو لە هەمووشی خەمناك تر کە ئێمەی بە گریان هێنا ئەو دوا فیشەکە بوو کە لە کەلەسەری خۆی دابوو. بەمشێوەیە چیرۆکی ئەم ئافرەتە پاڵەوانە کۆتایی هات.

ئەورۆژە شێخ ئەدهەمیش هاتبووە سەر سنوور بەمەبەستی بەسەرکردنەوەی چەکدارەکانی ، ئیمەش کە لەگەڵ محەمەد عیمادی برازاکەی دەمانەویست بچینەئێران بۆلای شێخ ئەدهەمی مامی لەبەر ئەو زرووفە ناچاربووین ڕابوەستین . ئەوەبوو هەرلەسەر سنوور خۆمان بە شێخ

ناسـاند بـﻪلاَم کاتێـك ویسـتمان لـﻪ سـنوور بچـینﻪژوورﻩوﻩ سـﻪربازﻩکانی سﻪرسـنوور وتیـان دﻩبـێ ئـﻪمڕۆ یـﻪکێکتان بچـن و بـﻪیانیش یـﻪکێکی ترتـان چونکﻪ ئﻪمڕۆ شێخ میوانی زۆرﻩو لﻪ دﻩکﻪس زیاتر بۆی نیﻪ بباتﻪ ئێران .

ئﻪوﻩبوو ئێمﻪش بﻪ برازاکﻪی شێخمان وت کﻪ دﻩبـێ کارێکیوابکـات کـﻪ من و مامۆستا شێخ حوسێن بﻪیﻪکﻪوﻩ بچین و لێك دانﻪبڕێین بۆیـﻪ وتمـان کـﻪ بﻪ مامی بلێ بﻪلکو بﻪ پاسدارﻩکان بلێ . محﻪمﻪد عیماد گوتی دﻩبـێ بـﻪ (ت) بلـێم چـونکﻪ ئـﻪو جﻪندرمانـﻪ بﻪقسـﻪی ئـﻪو دﻩکـﻪن چـونکﻪ ئـﻪو سـﻪربﻪ ئیتیلاعـات و قﻪرارگـﻪی ڕﻩمﻪزانیشـﻪ. ئـﻪوﻩبوو بـﻪوی ووت، ئـﻪویش بـﻪ پاسـدارﻩکانی وت زۆر بﻪئاسـانی ڕێگایـان دایـن و دﻩرگـای سـنووریان بـۆ کردینﻪوﻩو بﻪرﻩو نﻪغﻪدﻩ بﻪڕێ کﻪوتین .

پێش نیوﻩڕۆ گﻪیشتینﻪ نﻪغﻪدﻩ چوینﻪ تﻪکیﻪی شێخ و نانی نیوﻩڕۆمـان لﻪوێ خوارد و دوای نیوﻩڕۆش پیاسﻪیﻪکی نـاو بازاڕمـان کـردو بـۆ ڕۆژئـاواش گﻪڕاینﻪوﻩ و شﻪو لﻪگﻪڵ هﻪندێ کﻪسی خزمو کﻪسی شێخ لﻪ تﻪکیـﻪ شـﻪومان بﻪ سﻪربردو بۆ بﻪیانیش دوای خـواردنی نـانی بـﻪیانی شـێخ ئﻪدهـﻪم و شـێخ ئﻪیووب شێخ بـابۆ هاتنـﻪ تﻪکیـﻪو لﻪگـﻪڵ ئێمـﻪ دانیشـتن.هﻪرلﻪو دانیشـتنﻪدا شێخ ئﻪیووب هﻪندێك گۆڤاری بﻪناوی ( هﻪڤووت ) پێشـکﻪش کـردین و ووتـی لﻪ سویسرا من ئﻪم گۆڤارﻩ دﻩردﻩکﻪم .

شێخ ئﻪیووب وتی لﻪم گۆڤارﻩدا من بﻪناوی پێڕﻩش شت دﻩنووسم وبـلاو دﻩکﻪمﻪوﻩ و حﻪزیش دﻩکﻪم شتم بۆ بنووسن و بۆم بنێرن .

هﻪرئﻪو ڕۆژﻩ دوای خواردنی نانی نیوﻩڕۆ لﻪگـﻪڵ شـێخ ئـﻪیووب چـووینﻪ شاری وورمێو لامان دایﻪ چێشتخانﻪیﻪك و نانی ئێوارﻩمـان خـوارد و دوایـیش گﻪڕاینﻪوﻩ بۆ شاری شنۆ ، سﻪرﻩتا لﻪگﻪڵ شێخ ئﻪیوب چوینﻪ بارزان ئاباد بۆ سﻪر گـۆڕی شـێخ بـابۆی بـاوکی شـێخ ئـﻪیوب و براگـﻪورﻩی بـارزانی نـﻪمر ، گۆڕسـتانﻪکﻪ بـﻪناوی بـارزانی بـوو لﻪراسـتیدا لـﻪ نزیـك مالـﻪ پﻪناهﻪنـدﻩکانی

کوردی عێراق بوو لە شنۆیە . فاتیحەمان لەسەر گۆڕەکەی خوێند و هەندێك وێنەشمان گرت و تەماشای گۆڕە کۆنەکەی مەلا مستەفاشمان کرد کە بۆ یەکەم جار لێی بەخاك سپێردرابوو بەر لە دەرهێنانی لەلایەن چەکدارەکانی قاسملۆ. دواتر چووینبۆ ماڵی دۆستێکی شێخ حوسێن ناوی میرزا سمایل بوو نزیکەی چوارشەو لەوێشماینەوەو زۆر بە خۆشیمان ڕابوارد و هەر لە شنۆیە مەلا ئەحمەدی خاوەن کتێبخانەی نالووسیمان ناسی و ڕۆژێك دەعوەتی کردین.

جارێکی تر چووینەوە ماڵی شێخ ئەدهەم و دوو شەوی تریش لەوێ ماینەوە، ئەوجا خواحافیزیمان لێ ی کردو بەرەو هەولێر گەڕاینەوە و بۆ بەیانی چووینەوە سەرکارەکەمان لە کۆلێژی یاساو رامیاری.

شایەنی باسە ، شێخ ئەیووب ئامۆزای کاك مەسعود بارزانییەو زاواشیەتی چونکە خوشکی ئەوی لەلایە و ئێستاکە لە شاری جنێف لە سویسرا دادەنیشێت.

جارێکی تریش لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٩٩٩ لە مەسیف سلاح الدین دیسان من و مامۆستا شێخ حوسێن دەعوەتی شێخ ئەدهەم بووین ، بەلاّم ئەوجارەیان بەشەو. زۆرگفتوگۆمان کرد و لەبارەی زۆر مەسەلە ووتووێژمان کرد.

## ئەزموونی شێوەکاریم

هەر لە منداڵیەوە ئارەزووی نیگارکێشانم هەبوو، بۆ ئەم مەبەستە بەشداری گشت پیشانگای ساڵانەی چالاکی قوتابخانەکانم کردووەو لە قۆناغی ئامادەییشدا، لەسەر دەستی مامۆستا مستەفا شەوکەت کە لە هەمان کاتیشدا خاوەنی وێنەگای جان بوو لە شاری هەولێر پەرەم بە بەهرەی هونەریم داو پێشکەوتنێکی زۆرم بەخۆمەوە بینی، تەنانەت هەمووساڵێك قوتابخانەکەمان(ئامادەیی کوردستان) بە یەکەم دەردەچوو منیش خەڵاتی یەکەمیم وەردەگرت. لە شوباتی ساڵی ١٩٧٦ یەکەم پیشانگای شێوەکاری تایبەتی خۆم لە قوتابخانەی ئەیوبیەی سەرەتایی کردەوەو کۆمەڵێك تابلۆم بۆ گوزارشتکردن لە دۆزی کوردو مەینەتیەکانی مرۆڤی کورد نمایش کردبوو کە بووە مایەی سەرسوڕمانی بینەران لەو دەمەداو بەشێك لە بینەران لە دەفتەری تێبینیەکاندا ڕاوسەرنجی خۆیان لەو بارەیەوە بۆ نووسیبووم.

هەروەها دوو پیشانگای تایبەتی تریشم لە ساڵانی ( ١٩٨٥و ١٩٨٩) کردەوەو چەند تابلۆیەکم تیا بلاوکردنەوە کە تیایاندا گوزارشتم لە خاپوورکردنی گوندەکانی کوردستانو قەتلو عامکردنی کوردان کردبۆوە.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، لە ساڵی ١٩٨٤کەویستم پیشانگای دووەمی شێوەکاریم بە سەرپەرشتی لقی هەولێری سەندیکای هونەرمەندانی عێراقی بکەمەوە، کە ئەو دەمە هونەرمەندی شانۆکار سەفوەت جەراح سەرۆکی لق بوو، ڕەزامەندی بۆ کردمو بڕی سێسەد دیناری سویسری بۆ خەرج کردمو منیش بەو بڕە پارەیە چوارچێوەم بۆ تابلۆکانم دروستکردو فۆڵدەرێکیشم بە ناوونیشانو وێنەی هەندێك لە تابلۆکانم چاپکرد. جا ئەوەبوو ڕیکلامم لەزۆربەی شوێنە گشتییەکان کردبوو بۆ کردنەوەی ئەو پیشانگایە، بەلام ئەوەی ڕوویدا ئەوەبوو ڕۆژێك بەرلە کردنەوەی پیشانگاکە کاك سەفوەت بەدوای ناردمو ووتی گشت فۆڵدەرەکانمان بۆ بێنە ئێمە خۆمان بۆتی دابەش

دەکـەین. منـیش ووتم زۆربـەیم دابەشـکردووەو تـەنها کـەمێکی مـاوە. ووتـی قەیناکات ئەوەی ماوەتەوە بـۆم بێنـە. جـا ئـەوەبوو کاتێـك فۆڵـدەرەکانم بـۆ بـردەوە ووتـی ئـەم پیشـانگایە نـابێ بکەیتـەوە. ووتم بـۆ؟ ووتـی تـۆ وێنـەی ڕووخانو بۆردومانکردنی گوندەکانی کوردستانت کردووە نـازانی ئەمـە مانـای چیە؟ تۆ دەتەوێ بڵێی حکومەت ئەمەی کردووە، بۆیە پارەکـەشمان بـدەوەو ئەو تابلۆیانەش نمایش نەکەیت. بەم ڕووداوە زۆر توڕەبووم ووتم من پارەکەم گشتی خەرج کردووەو ناتدەمەوە، سەبارەت بە ناوەڕۆکی تابلۆکـانیش ئـەوە تۆی وا دەڵێی من وام نەووتووەو خۆ لەسەر دیمەنی ڕووخاوی گوندەکان نـەم نووسیوە حکومەتی عێراق ئەمەی کردووە، بەڵکو تەنها نەهامەتییـەکانی ئـەم میللەتەم خستۆتە ڕوو.

بەهەرحاڵ ، لەسەر گشت ئەو ڕیکلامانـەی کـە هەڵمواسـیبوون نووسـیم لەبەر چەند هۆیەك پیشانگاکە نەکرایەوە. بەڵام هەر دوای ماوەیەکی کـەم لـە ڕێگـای کۆمـەڵی هونـەرو وێـژەی کـوردی لقـی هـەولێرەوە ئـەو پیشـانگایەم کـردەوە بـە هـەمان فۆڵـدەرو تابلۆکـانی پێشـووەوە. ئەوکاتـە عبـدالوهاب تاڵـەبانی سـەرۆکی کۆمەڵەکـەمان بـوو هـەروەها هونەرمەنـد چـەتۆ حەسـەن بەڕێوەبەری هۆڵی میدیا بوو.

لە ساڵی ١٩٨٩ پیشانگای سێیەمی شێوەکاریم لە هـۆڵی میـدیا کـردەوە بـە سەرپەرشـتی پارێزگـاری هـەولێرو لەڕێگـەی کۆمـەڵی هونـەرو وێـژەی کوردیەوە، ئەوکاتە هونەرمەند خەلیل یابـە سـەرۆکی کۆمەڵـە بـوو، مامۆسـتا چەتۆ حەسەنیش بەڕێوەبەری هۆڵی میدیا بوو. کاتێك تابلۆکانم هەڵواسی، کە زۆربـەیان گوزارشـتیان لـە دۆزی کـوردو سـوتانو خـاپوربوونی گونـدەکانی کوردستان دەکرد، تابلۆیەکی گەورەم بە قەبارەی مـەترونیوێك بـە دوو مـەتر لە ناوەڕاسـتی هۆڵەکـە هەڵواسـیبوو، گوزارشـتی لـە سـووتانی گونـدو قیـژەو هـاواری دایـكو منـاڵ دەکـردو لـە ناوەڕاسـتی تابلۆکـە بۆکسـێکی گـەورە

دەرهاتبوو بـە گـەورەیی لەسەریمنووسـیبوو (کـوردمو ناتوێمـەوە). مامۆسـتا چەتۆ حەسەن کە چاوی پێی کەوت ووتی کەمال ئەو تابلۆیە زۆر زەقە بیهێنە خوارەوە با تووشـی کێشـەمان نـەکات. منـیش ووتم مامۆسـتا قورسـایی ئـەم پیشـانگایەم لـەو تابلۆیەدایـە یـان پیشـانگاکە ناکەمـەوە، یـانیش نایهێنمـە خوارەوە. ووتی دە مادام وایـە تـەنها دەسـتەواژەی کـوردم لاببـە ئـەوەی تـر وەك خۆشی بمێنێتەوە قـەیناکات. جـا ئـەوەبوو هـەر لـەویّ لەبەرچـاوی ئـەو بەتیوپی سپی ئەو دەستە واژەیەم کوژاندەوە. کاتێك پارێزگاری هەولێر یحی جاف هـاتو پیشـانگاکەی کـردەوەو بەیەکـەوە بـەناو هۆڵەکـەدا خولاینـەوە، ئاگری لیّ دەباری لە بینینی تابلۆکان مورتـاح نـەبوو، بۆیـە کاتێـك داوام لێـی کـرد شـتێکم بـۆ بنووسـیّ، زۆر بـە نابەدڵیـەوە دوو ڕسـتەی بـیّ مانـای بـۆ نووسیمو تەنانەت هیچ بڕە پارەیەکیشی وەك پاداشت بـۆ خـەرج نـەکردم کـە عادەت وابوو خەرج بکریّ.

لەماوەی ڕابردوودا تا سـاڵی ١٩٩٠ لـە چـەندین پیشـانگای تایبـەتیو بـە کۆمــەڵ لــە شــاری هــەولێرو دەرەوەیــدا بەشــداریمکردووە و دەیانجــار خەڵاتکراومو مەدالیای ڕێزلێنانم وەرگرتووەو جارێکیشیان لە ساڵی ١٩٧٧ لـە پیشـانگایەکی چـالاکی قوتابیـان کـە بـۆ سـەرجەم قوتابخانـەکانی عێـراق لـە شـاری بەغـدا کرابـۆوە سـەرکەوتوو بـوومو بڕوانامەیـەکی ڕێزلێنـانم بـەواژۆی وەزیری پەروەردەی عێراق وەرگرت.

## ئەزموونی ڕۆژنامەگەریم

سەرەتای کاری ڕۆژنامەنووسینم دەگەڕێتەوە بۆ سالآنی حەفتاکان ، لەساڵی ١٩٧٥ بۆیەکەم جار پارچە هۆنراوەیەکم لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ لەژێر ناوونیشانی نامەیەك بۆخۆشەویستەکەم بە نازناوی کەمال چارەڕەش بلأوکردەوە ، دوابەدوای ئەوە نوسینێکی ترم بەناوونیشانی پیشەی ئەم شێتەدەبێ چیبێ هەر لە هەمان گۆڤار بلأوکرایەوە . ئیتر لەوەبەولاوە وردە وردە لەڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکانی عێراق بابەتم بلأو دەکردەوە . زۆربەعیشقەوە تەماشای کاری ڕۆژنامە نووسیم دەکرد بۆیە هەرزوو خولیام کەوتە سەر هەڤپەیڤین وئامادەکردنی ڕاپۆرتی هونەری وبۆئەم مەبەستە چاوپێکەوتنم لەگەڵ دەیان هونەرمەندی ئەکتەرو شێوەکارو گۆرانیبێژسازدا بێ ئەوەی پەیامنێری یەکێك لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە بم کە ئەوبابەتانەم بۆدەناردن بەتایبەتی ڕۆژنامەی هاوکاری دیارە هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ هەستی پاك وجوامێرانەی سکرتێری نووسینی ئەو ڕۆژنامەیە مامۆستا عەبدولا عەباس کە چاوپۆشی لێدەکردین وهەموو دەم هانیدەداین، تەنانەت هەندێك جاریش کەموکوڕیەکانیشی بۆ دەبڕین بۆنمونە یەکێك لەو چاوپێکەوتنانە لەگەڵ هونەرمەند عەبدولا ڕەسول و فوئاد عەبدولڕەحمان بوو هەروەها یەکێکی تریشیان گەشتێك بەمەڵبەندی ئیشی دەستی مامۆستایان لە شاری هەولێر هەروەها چاوپێکەوتنێك لەگەڵ سێ مامۆستای نەهێشتنی نەخوێندەواری هەروەها چاوپێکەوتنێك لەگەڵ هونەرمەندی خووا لێخۆشبوو ئەکتەری کۆمیدی فتح الله عمر ئەمەو لەهەمووشیان دیارتر ئەوڕیپۆرتاژەبوو کە بە سێ زنجیرە بلأوم کردەوە لەژێر ناوونیشانی گەشتێك بە ئەشکەوتەکانا...

شایەنی باسە دووەم زنجیرەی بابەتی گەشتێك بە ئەشکەوتەکانا لە ژمارە ٣٣٠ ڕۆژنامەی هاوکاری لە ڕۆژی١١ / ٦ / ١٩٧٦ بلأوکرایەوە . ئەوەی

ڕاستی بێت ئەم بابەتە سەرنجی خوێنەرانی زۆر ڕاکێشا بۆیە دەتوانم بەخاڵی وەرچەرخانی دابنێم لە کاری ڕۆژنامە نووسی خۆمدا . ئیترلەوە بەدواوە توانیم وەك ڕۆژنامە نوسێك خۆم ببینمەوە بەبێ ئەوەی ئەندامی سەندیکای ڕۆژنامە نووسان بم .

وەك هاووڵاتیەکی هەزار زۆر پشت ئەستور بووم بە ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی وڵاتەکەم بۆیە هەرگیز بە دەسەڵاتێکی بەهێز سەیرم دەکردو بەهەقیقەت بەدەسەڵاتی چوارەم تێی ئەگەیشتم بۆیە لەکاتی تەنگانەدا بۆگەیاندنی دەنگم بۆ ئەو لێپرسراوانەی کە دەنگم نەیان ئەگەیشتێ پەنام دەبردە بەر ڕۆژنامە بۆ ئەم مەبەستە چەندین بابەتم لە ڕۆژنامەکان بڵاوکردۆتەوە بۆنمونە جارێکیان ڕێم کەوتە کارگەی چاکردنەوەی سەلاجەو موجەمیدەی شەرکەی ئەفریقیکە سەر بە ئەمینداریێتی کاروباری دارایی‌و ئابووری هەرێمی کوردستان بۆ چاکردنەوەی موجەمیدەکەم کە بە هەزار دەردەسەری وبە قەرزو فەرز کڕیبوم بەڵام لە ئەنجامدا بۆ سمێڵ چوم و ڕیشم نالەبانی ئەوەبو ئەوجارەیان موجەمیدەکەم بەیەکجاری لە کارکەوت .بۆئەو مەبەستە نوسینێکم لەڕۆژنامەی هاوکاری ڕۆژی ١٩٨٤/٨/٩بڵاوکردەوە لەژێر ناوونیشانی نامەیەکی کراوە بۆبەرچاوی بەڕێز ئەمینداری گشتی داراییو ئابووری تیایدا بەرپرسیارێتی خراپبوونی موجەمیدەکەمم خستبوە ئەستۆی کارمەندانی دەزگاکەی ئەو، نامەوێ لێرەدا کێشەکە دووبارە بکەمەوە چونکە دەقی نوسینەکە وەکوخۆی لەپاشکۆدا بڵاوکراوەتەوە لەڕاستیدا ئەم نوسینەی من هەرچەندە منی نەگەیاند بەمافەڕەواکەم بەڵام سەرنجی نێوەندی ڕۆشنبیریو ڕۆژنامەگەری کوردی بۆخۆی ڕاکێشا ئەوەش بۆمن دەسکەوتێکی مەعنەوی بوو . ئەم کێشەیە ماوەیەکی خایانددوابەدوای ئەوەی کە ئەمینداری گشتی بەڕەسمی لە ڕێگای ڕۆژنامەی ناوبراو وەڵامی دامەوەو قەرزارباریشی کردمەوە هەروەکو لەڕۆژنامەی هاوکاری لەژمارەی

١٩٨٤/١٠/٤دادەقەکـــەی بلأوکراوەتـــەوە . دووبـــارە لەرۆژنامـــەی رۆژی ١٩٨٤/١٠/٢٥ بەکۆمەلێك بەلگـە وەلأمـی ئەمینـداریێتیم دایـەوە بـەلأم دیـاربوو ئەمینداریێتی ناوبراو بەهەموو شێوەیەك دەیەویست پشتگیری لـە کارمەنـدانی دەزگاکەی خۆی بکات بۆیـە لـە ڕوانگـەی خۆیەوەسـەیری کێشـەکەی دەکـرد بۆئەم مەبەستە دیسان جارێکی تر لە ژمارە ٧٦٧رۆژی ١٩٨٤/١٢/١٣بەدرێژی وەلأمی دامەوە منیش وەکوجاران ئاسا وەلأمێکـی دوورو درێـژم بـۆی ئامـادە کرد هەرلەهەمان کاتیشدا سـکرتێری نووسـینی رۆژنامەکـە مامۆسـتا عەبـدولاَ عەباس لە ڕێگای پەیامنێرەکەیان شێرزاد عبدالرحمن لە هەولێرەوە خەبـەری بۆ دەناردم کە زوو وەلأمی ئەمینداریێتییگشتی بدەمەوە بەلأم کەلێم کۆلێـەوە بۆم بەدەرکەوت هەندێك کەس هەبوون ئیستغلالی کێشـەکەی دەکـرد بۆخـۆی وەتوانیبووشـی کـەناڵێکی پەیوەنـدی لەگـەلّ هەنـدێك لێپرسـراوی دەزگاکـە دروسـت بکـات وتەلـەفزیۆنێکی ڕەنگـاوڕەنگ وەربگرێـت بۆیـە کـەدلّنیابووم لەوەی کە مەحالە بەمافی خۆم بگەم بەباشم زانی واز لـەوەلأم دانـەوە بهێـنم وتەنانەت ئەونوسراوەی ئامادەشم کردبوو لایخـۆم گلـم دایـەوەو هەرچـەندی داوایان لێکردم بۆم نەناردن وهۆیەکەشم پێ نەوتن .

شایەنی باسە دوای دووساڵ کاتێك لە کۆلێژی یاساو ڕامیاری دەمخوێنـد ئەمینـداری نـاوبراو (مەبەسـتم خوالێخۆشـبوودکتۆر سـەعدی بەرزنجییـە) لـە پۆسـتەکەی بەخشـراو بوەمامۆسـتام ووانـەی ( الالتـزام ) ی پـێ دەوتینـەوە لەسەرەتا زۆر لێی دەترسام نەوەکا لەتۆڵەی ئـەو نووسـینانەم لەدەرسـەکەی خۆی بمکەوێنێ بەلأم بەپێچەوانەوە ئەوکاتـە پایـەی ئـەوڕێزدارەم بـۆ بـەدیار کەوت تەنانەت ئـەمووت خۆزیـا زووتـر بمناسـیبوایە چـونکە پیـاوێکی زانسـت پەرست بوو .

شـایەنی باسـە بەدرێـژایی رۆژگـار بـۆم بـەدیار کـەوت کەچـەند ئـەو ڕێزدارەکـارگێڕێکی سـەرکەوتوە لـە ژیانیـدا بەتایبـەتی دوای ئـەوەی کـەبوە

ڕاگری کۆلێژەکەمان لەسەر دەستی ئەو خوێندنی ماستەرمان تەواو کردو دەتوانم بڵێم لەوێوە بناغەی زانستیمان دروست بوو بۆیە ئەو سامانە فکریەی لە هەردو قۆناغی خوێندنی بەکالۆریۆس و ماستەر پێی بەخشین نرخەکەی زۆر زیاتر بولەو سامانەی هەمان بو یان چاوەڕێمان دەکرد.

یادگاریەکی تر لە یادگاریەکانم دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ساڵی ١٩٨٧کاتێك پارچە زەویەکم لەپشت نەخۆشخانەی منداڵان لەشاری هەولێر کڕی ، هێشتان ئاووکارەباو قیرتاوی بۆ نەچووبو بەلأم من بەوە هەڵخەڵەتام گوایە ئەو گەڕەکە هی خانەوادەی دیل وشەهیدەکانی جەنگی عێراق وئێرانەو حکومەت ڕیزیان لیَئەگرێت و بەرلە گەڕەکەکانی تر خزمەتگوزارییان بۆ دەبات بۆیە هەرزوو خانوێکم لەسەری بەرز کردەوە بەلأم لێکدانەوەکەم وادەرنەچو جاریَ پێش هەموو شتێك تەنیا من تیایاندا الحی المرزوق بووم تەنانەت دیلەکانیش لەحوکمی ون بوودابون بۆیە ئەرکی بەسەرکردنەوەی شارەوانی و ئاوو زێرابەکان ودایەرەی کارەبا کەوتە سەرشانی من دوای هاتوچونێکی زۆر کەهیچم بەهیچ نەکرد دیسان جاران ئاسایی پەنام بردەوە بەر ڕۆژنامەو لەڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە٨٨٣ی ڕۆژی ١٩٨٧/٣/١٩نوسینێکم لەژێر ناوونیشانی نامەیەك بۆ شارەوانی ...دیارە بەڕێوەبەری کۆن ئامێرو ئیمکانیەتی شارەوانی لەگەڵ خۆی بردووە ! ! بڵاو کردەوە تیایدا گلەییو گازاندەم لە بەڕێوەیەری شارەوانی کردبوو بۆ پشت گویَ خستنی داواکەمان ...دەتوانن بۆ زانیاری زیاتر بگەڕێنەوە سەر دەقی بابەتەکە لە پاشکۆی ئەم کتێبە . ئەم نوسینەم زۆر سەرنجی لێپرسراوانی ڕاکێشا بۆیە هەر بە پەلە پارێزگاری هەولێر لەدوو بەڕێوەبەری شارەوانی ناردبوو وداوای لیَ کردبوو کە بە پەلە کەشفێکی پێشکەش بکات و لەماوەی سیَ مانگ گشت شەقامەکانی گەڕەکەکە قیرتاو بکات. سەرۆکی شارەوانیش بە دەوری خۆی بەدوای منی داناردو پێی ڕاگەیاندم کە پارێزگار فەرمانی داوە قیرتاوەکەمان بۆ بکرێت

بەلأم سەرەڕای ئەوەش گلەیی و گازاندەشی لێکردم کە نەدەبوو لە ڕۆژنامە لە سەری بنووسم،گوایە ئەو تەقسیری نەکردوە چونکە حکومەت گشت ئامێرەکانی بۆ تێکدانی گوندەکانی کوردستان ناردوەو گوایە گشست پڕۆژەکان بە فەرمانی پارێزگار ڕاوەستاوەو کەچی ئێستاکە پارێزگار خۆی لێدەرهێناوەو ئەویشیان خەتابار کردووە .لەڕاستیدا بەرلە نوسینی سکالأکەم وبەرلە بلأوکردنەوەی لەڕۆژنامەدا سەردانی پارێزگاریشم کردبوو ئەو کاتە نزیکەی سی هاوولأتییێکی لەلابوو لەوانە سەید کەریم منیش لەبەر ئەوەی مەراقم بوو بزانم سەید کەریم بۆچی هاتۆتە لای پارێزگار بۆیە خۆم خستە دواوەو دوا کەس باسی کێشەی خۆمم کرد بەلأم لەهەموی سەیرتر ئەوەبو سەید کەریم بەخۆی و شیرە تیژەکەیەوە وکۆمەلێك زەرگ و دەفەوە چووە بەردەم پارێزگارو ئەلبوومێکی گەورەی لەبەردەم ابراهیم زەنگەنەی پارێزگار داناو کەوتە پێناساندنی یەکە یەکەی کەسایەتی نێو ئەلبوومەکە یەکێك لەو وێنانە وێنەی باوکی ابراهیم زەنگەنە بو. یەکێکی تریشیان وێنەی باپیری بوو، پارێزگار سەری سوڕما وتی سەیدکەریم من وێنەی باپیری خۆمم نەبینیوە تۆ چۆن پەیدات کردووە ؟ سەید کەریمیش وێنەیەکی گەورەی لەسەر سینگی خۆی دابو ئیشارەتی بۆی کردو ووتی ئەمەش وێنەی باپیرە گەورەتە . ئەوجارەیان پارێزگار بەجارێك سەری سوڕما ...وتی ئێستا بلێ چیت دەوێ تابۆت بکەم ؟ ووتی دەمەوێ پارچە زەوییێك بدەیتە شێخ تاریقی کوڕم ئیجازەی هەلگرتنی چەکیش بدەیتە من.

ئەویش ووتی بۆ زەویەکە ئەوا ڕەزامەندیت بۆ دەکەم بەلأم بۆ ئیجازەی چەکەکە بەلێنت دەدەمێ کەی چەکت پەیدا کرد ئەویشت بۆ دەکەم .

سەید کەریمیش ووتی شێمەی هارونی وەعدی داومەتێ ئەگەر تۆ ئیجازەم بۆ بکەیت ئەویش دەبانچەیەکم دەداتێ . ئەوەبوو دوای ئەم هەموو بینەو بەردەیە هەردوو داواکەی بۆ جێبەجێکرد .

ئێمەش دوای هەموان نۆرەمـان هـات کەچـی لـە ئەنجامـدا هیچیشـی بـۆ نەکردین بۆیە بڕیارم دا لە ڕۆژنامە دەنگم بەرز بکەمەوە .

لە کۆتاییدا، دوای ئەم ئەزموونە درێژە توانیم هیواو ئاواتەکانم لە بـواری ڕۆژنامەگەریـدا بێنمـە دی، ئـەوەبوو لـە دوای ڕاپـەڕین بوومـە سەرنووسـەری ڕۆژنامــەی پارێزگــاران‌و ڕۆژنامــەی ســەربەخۆیی کــە پــارتی پارێزگــارانی کوردســـتان دەریـــدەکردن، دواتـــر لـــە ١٩٩٦/١١/٣بـــە فـــەرمانی دەزگـــای چاپەمەنی‌و ڕۆژنامەگەری‌و بڵاوکردنەوەی وەزارەتـی ڕۆشـنبیری ژمـارە ٣ لـە ١٩٩٦/١١/٣ لەسەر داوای شاکر ڕۆژبەیانی بەڕێوەبـەری گشـتی ئـەو دەزگایـە بۆماوەی چەند ساڵێك بوومە ئەندامی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەی هـەرێمی کوردسـتان کـە زمانحـاڵی وەزارەتـی ڕۆشـنبیری بـوو لـە حکومـەتی هـەرێمی کوردستان، هـەروەها لـە سـاڵی ٢٠٠٥ تـا ٢٠١٢ بـە حـوکمی ئـەوەی ئەنـدامی دەسـتەی بـاڵای یـەکێتی مافپـەروەرانی کوردسـتان بـووم، ژمـارە ٢٤ تـا ٤٥ بوومە سەرنووسەری گۆڤاری تـەرازوو کـە یـەکێتی مافپـەروەرانی کوردسـتان دەریدەکرد. هەروەها لە ژمارە٢ تا ١٢ بوومە جێگری سەرنووسـەری گۆڤـاری ڕاگەیاندن کە پەیمانگای تەکنیکی هەولێر دەریدەکرد. هەروەها بۆیەکەم جار بە بۆنەی ئاهەنگی دەرچوونی قوتابیـانی زانکـۆ سـاڵانە ژمارەیـەکی ڕژنامـەی (دەنگی زانکۆ) م دەرکرد، کە دواتر بووە نەریتێکی زانکۆو هەموو ساڵێك ئەو ڕۆژنامەیـە بـەو بۆنەیـەوە دەردەچـوو، هـەروەها بـە بۆنـەی بەڕێوەچـوونی یەکەمین کۆنفرانسی زانستی خوێندنی باڵا ڕۆژانە ڕۆژنامەیـەکم دەردەکـرد بـە ناوی (کۆنفرانس) کە چوار ژمارەی لێ دەرچوو.

## دیداری کەڵەکین

لە ساڵی ١٩٩٦ ئەوکاتەی کە ئەندامی سەرکردایەتی پارتی پارێزگارانی کوردستانو سەرنووسەری هەردوو ڕۆژنامەی پارێزگارانو سەربەخۆیی بووم، دۆستو هەوادارمان زۆربوون، بە تایبەتی کۆمەڵێك کەسایەتی شاری هەولێر کە نزیك بوون لەعومەراغای سورچی سەرۆکی پارتی پارێزگارانی کوردستان سەردانی ئێمەیان دەکرد. سێ کەس لەو کەسایەتیانە (مومتاز حەیدەریو تاریق جامبازو سەید مەولود بێخاڵی) بوون، چونکە ئێمە ئەوکاتە دروشمی سەربەخۆییو مافی چارەی خۆنووسیمان لە حیزب بەرزکردبۆوەو دواتریش لە ڕێوڕەسمێکی شکۆداردا ئاڵای کوردستانمان بەرزکردەوەو ئاڵای کوردستانیشمان کردە دیاری بۆ ئەو بەڕێزانە، جا ئەوەبوو عومەراغای سورچی پێی ووتم ئەو بەڕێزانە حەزدەکەن گوندی کەڵەکین سەرچیا ببینن بۆیە ڕۆژێکیان بۆ دابنێ تا دەعوەتیان بکەم بۆ ئەوێ.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، لەبەرئەوەی پێشتر زۆرجاران کە مامۆستا عبدالخالق زەنگەنە دەهاتە لای عومەراغا لەگەڵ من بابەتێکی هەستیاری دەوروژاند ئەویش بیرۆکەی کۆکردنەوەی ڕۆژنامەنووسان بوو بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەیەك بۆ ئەم پیشەیە. جا ئەوەبوو من بەباشم زانی لە جیاتی دەعوەتکردنی تەنها ئەو سێ بەڕێزە، دەعوەتەکە ئاراستەی نوێنەری سەرجەم ڕۆژنامەو گۆڤارو تەلەفزیۆنو ڕادیۆکانی ئەوکاتی هەرێمی کوردستان بکەین بەبێ جیاوازی.جا ئەوەبوو بەناوی نەجات عومەر سورچی خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەی سەربەخۆییو بە بۆنەی یادی نەوەدو هەشت ساڵەی جەژنی ڕۆژنامەگەری کوردییەوەدەعوەتنامەیەکمان ئاراستەی نوێنەری سەرجەم ڕۆژنامەو گۆڤارو تەلەفزیۆنو ڕادیۆکانی ئەوکاتی هەرێمی کوردستان کرد بۆ کەڵەکین. ئەوەبوو ڕۆژی پێنجشەممە ڕێکەوتی ١٩٩٦/٥/٩ سەرجەم کەناڵەکان تەنانەت بەپارتیو یەکێتیو بە وەزارەتی ڕۆشنبیریشەوە

نوێنــەریان نــاردو شــەوو ڕۆژێــك لــە گونــد مانــەوەو بەرنامەیــەكی ڕۆشــنبیری تێروتەسەلیشــمان بــۆ ئــەو ڕۆژە دانــابوو، كــە خــۆی لــە چــەند چــالاكییەكی هونەریو ڕۆشنبیری دەبینیەوە. هەر ئەو شەوەش لەگەڵ مامۆستا عبدالخالق زەنگەنــە بیروڕامــان ئــاڵوگۆڕكرد بــۆ موفاجەئــەیك كــە خــەونی زۆربــەی ڕۆژنامەنووسان بوو كە تاوتوێكردنی بیرۆكەی دامەزراندنی كۆمەڵەیەك بوو بۆ ڕۆژنامەنووسان.

بەهەرحاڵ بۆ بەیانی لە دەسپێكی بەرنامە ڕۆشنبیرییەكەدا ڕامان گەیاند كـە بیرۆكەیـەكی وامـان هەیـە. بەڕاسـتی بەدەنگـەوەهاتنی ڕۆژنامەنووسـانی ئامادەبوو لەسەرووی پێشـبینی ئێمـەوە بـوو، بۆیـە دوای موناقەشـەكردنێكی گــەرمو گــوڕو ئــالوگۆڕكردنی بــیروڕا، بــەناوی گشــت ئامادەبووانــەوە بانگـەوازێكمان بلاوكـردەوە كەتیایـدا هـاتبوو: (( ئێمـە كـە سـیو حـەوت ڕۆژنامــەنووسو نووســەر لەســەر داوەتــی ڕاگەیانــدنی پــارتی پارێزگــارانی كوردستان بە بۆنەی یادی نەوەدو هەشت ساڵەی ڕۆژی ڕۆژنامەگـەری كـوردی لــە گونــدی كەلــەكینی سەرچــیا ئێــوارەی ڕۆژی ١٩٩٦/٥/٩ كۆبووینــەوەو دیــدارێكی ســەرەتایی ڕۆژنامەنووســیمان بەســتو دوای لێكۆڵینــەوەو هەڵســەنگاندنی بـاری واقعـی ئـەمڕۆی ڕۆژنامەنووسـی لـە كوردسـتاندا دوای ڕاپــەڕینو لــە ئــەنجامی بــاری نائاســاییو ســەرهەڵدانی شــەڕی كــورد كــوژی وێرانكارانـەو شـیرازە پچـڕانی بـارودۆخی ئـابووریو كۆمەلایـەتیو ئاسـایشو چەندین گیروگرفتی سـەختو دژوارو كێشـەی ئـاڵۆز، لەسـەرویانەوە تەقـەلای خەفە كردنی ئەو نیمچە ئازادیەی كـە بەرهـەمی ڕاپەڕینـە مەزنەكـەی ئـاداری ١٩٩١ ه، گەیشـتینە ئـەو قەناعەتـە، وێـڕای فـرە ڕۆژنامـەیی كـە بـە گشـتی ڕۆژنامەی حزبینو بەشێكی زۆریان ڕەنگدانەوەی سیاسەتی حزبایەتی تەسكن بەپێی ئەو واقیعەی كە تیایدا هەناسە دەدەنو جڵەوكێش كراون، كە نەبوونی سەندیكایەكی ڕۆژنامەنووسی بەرگری لە مافی ڕەوای ڕۆژنامەنووسی بكات تـا ئێستا نەهاتۆتە كایەوە.

پێمان باشه هەرنەبێت ئەم كۆبوونەوه سەرەتاییەی کە بۆ ڕاگۆڕینـەوە بوو لەم کاتەناسکەی ئەزموونەکەمان پێیدا تێدەپەڕێت بە درەنـگ وەختـەوە سازدرا، ببێتە بنەمای ڕەخساندنی زەمینەیەکی لەبار بۆ پێکهێنانی کۆمەڵەی ڕۆژنامەنووسانی کوردستان بە هاریکاری دەستەی ڕۆژنامەنووسـانی ئازاد.کـە هەموو لایەك بە گیانێکی دڵسۆزانەو لەخۆبوردوانە شـانی بدەینەبـەرو هـەنگاو هـەڵێنین بـەرەو ئاسـۆیەکی گـەش‌و دوارۆژێکـی ڕونـاکی کوردسـتان، کـە لـە باوەشی‌و ئاکامیدا سەندیکاییێکی ڕۆژنامەنووسان لەدایك بێت.

ئەم هەنگاوە ئەرکی پیرۆزی پاراستنی وشەی ڕەسەنی کوردی‌و ئازادی‌و دیموکراتی‌و مافی مرۆڤو مافەڕەواو پیشەییەکانی ڕۆژنامەنووسان بێت.

لە ڕوانگەی ئەم هەستکردنەمان بـە ئـەرکی مێـژووی ڕۆشـنبیری‌و ژیـاری سەرشـــانمان، وا ئـــەم دەستپێشـــخەرییە دەخەینـــە بـــەردەم ســـەرجەم ڕۆژنامەنووسـانی کوردسـتان بـەجیاوازی بـیروڕاو بۆچـوونیانەوە کـە هـەموو هەوڵ‌و تەقەلای دڵسۆزانەو ڕاستگۆیانە یەکخەین لەم پێناوەدا، کە چیتر ڕێزی ڕۆژنامەنووسانی کوردستان ئـەوها پـەرش‌و بـلاو نەمێنێتـەوە. لـەم پێنـاوەدا داوادەکـەین دیـدارێکی فراوانـی بەپەلـە بـۆ ڕۆژنامەنووسـان ببەسـترێت‌و ڕۆژنامەنووسانی کوردستان بەشداری تێدا بکەن‌و داکۆکی لە ئازادی ڕۆژنامـەو کـاری ڕۆژنامەنووسـی بکرێـت، وڕۆژنامەنووسـان ڕۆڵـی خۆیـان بـۆ تـەبایی‌و سەقامگیرکردنی ئاشـتیەکی هەمیشـەیی‌و ئاسـاییکردنەوەو ئاوەدانکردنـەوەی کوردسـتان ببیـنن، هـەروەها کـاربکرێ بـۆ یادکردنـەوەی سـەد سـاڵەی ڕۆژی ڕۆژنامەگەری کوردی).

هـەروەها لـە کۆتـایی دیدارەکـەدا لیژنەیـەکی بێلایـەنی ئامادەکاری بـۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکان لە بەڕێزان: (کەمال غـەمبار، ممتـاز حەیـدەری، کـەمال سـەعدی، تـاریق جامبـاز، هـاوار کاکـەیی، مـەحمود زامـدار، غـازی حەسـەن) هەڵبژێردرا. لەم پێناوەشدا ئـەم بەڕێزانـە کـە ئامـادەی دیدارەکـە بـوون ئـەم

بانگەوازەیان ئیمزا کرد: ( عبدالخالق زەنگەنە، عەبدوللاَ ئاگرین، د.خلیل اسماعیل محمد، صدرالدین خۆشناو، ئاسۆ حەسەن، سەید مەولود بێخاڵی، تاریق جامباز، مەحمود زامدار، حەسەن جاف، د.شوکریە ڕەسول، ئیدریس لاوە، نازم دڵبەند، اسماعیل بەرزنجی، عباس عبدالله یوسف، محی الدین محمد، د.سرتیپ فتاح کاکەیی، ابراهیم مەلازادە، فارس سەعدی، بەهائەدین جەلال، هندرێن گوندی، شێرزاد مەسیفی، حامد محەمەد عەلی، رویسو گۆرگیس، شێرزاد عبدالرحمن، فەرهاد عەونی، حەیدەر عبدالرحمن، ئاسۆ کەریم، فریاد هیرانی، نەجات عومەر سورچی، ئیدریس جەلال، بێکەس حەمەد قادر، کەمال غەمبار، هاوار کاکەیی، مومتاز حەیدەری، غازی حەسەن، ڕەشید ڕەسول، کەریم سۆفی، کەمال سەعدی).

بەداخەوە، لە گەڕانەوەمان بۆ شاری هەولێر، هەر بۆ بەیانیەکەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان مامۆستا حەسەن جاف ی لە پۆستەکەی لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری دورخستەوە بۆهۆی ئامادەبوونی لەو دیدارە، ئەمەش بووە مایەی ڕەخنەی زۆربەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن کە دژ بە پرنسیپەکانی مافی مرۆڤو ئازادی بیروڕادەربڕینە.

## دیدارم لەگەڵ خوالێخۆشبوو عەونی یوسف

لە ساڵی ١٩٧٧ کاتێك بەرپرسی بەکرێدانی خانووەکانی هاوینەهەواری پیرمام بووم یەکێك لەو کەسایەتییە ناودارانەی کورد کە ئاشنایەتیم لەگەڵ پەیداکرد مامۆستا عەونی یوسف بوو. مامۆستا عەونی یوسف هەمووساڵێك لە پشووی هاوین بە خۆیو خانەوادەکەی دەهاتنە شاری هەولێرو لە هاوینەهەوارەکانی پیرمام خانوێکیان بەکرێ دەگرتو تیایدا نیشتەجێ دەبوون، جا منیش پێشتر زۆر گوێم لە ناوی ببوو بۆیە حەزم کرد بە ئاشنایەتی شاد بمو بۆ ئەم مەبەستە ئێوارەیەکیان چوومە لایو بەڕێزیان بە گەرمی پێشوازی لێکردمو زیاتر لە کاتژمێرێك لە باخچەکە لەگەڵم دانیشتو باسی زۆر بابەتی مێژوویی گرینگی بۆ کردم، لەوانە پەیوەندی بە حیزبی هیواو دواتر بە مەلا مستەفاوە، هەروەها تەکلیفلێکردنی لەلایەن سەدام حوسێنەوە بۆ دامەزراندنەوەی حیزبی هیوا. جا ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام ئەم ڕووداوەی دوایی بوو، گێڕایەوە لە ساڵی ١٩٧٤ کاتێك ڕێکەوتنی نێوان مەلامستەفاو حکومەتی ناوەندی تێك چوو، سەدام حسێن ئەندامی سەرکردایەتی حزبی بەعس غانم عبدالجلیل ی بە نوێنەرایەتی خۆی ناردە لامو پێی ووتم سەدام حسێن دەڵێ ئێوە لە ڕابردوودا ڕۆڵێکی زۆر گرینگتان هەبووە کاتێك لە حیزبی هیوا بوونە، بۆیە ئامادەیی خۆی نیشان داوە هەموو جۆرە یارمەتییێکی داراییو مەعنەویتان بکات بۆ دووبارە دامەزراندنەوەی ئەو حیزبە بۆ خزمەتکردنی کورد لەم قۆناغەدا. هەر لە میانی قسەکانیدا مامۆستا عەونی یوسف گوتی منیش ووتم لە ڕابردوودا پێویستی نەتەوەکەم وای دەخواست کە ئێمە بیر لە دامەزراندنی حیزبی هیوا بکەینەوە بەلاّم لە ئێستادا ئەم هۆکارە لە ئارادا نیەو ئێوەش هەموو شتێکتان بۆ خەڵکی عێراق بە کوردو عەرەبیشەوە دابین کردووە بۆیە پێویست بەمە ناکات، خۆ ئەگەر زروفێکی تر بێتە ئاراوەو ئەمە بخوازێ بێ دڵ لە دڵدان ئەوە دەکەین.

مامۆستا به پێکەنینەوه پێی ووتم دەزانی بۆ وام ووت؟ مەبەستم ئەوەبوو کـه وازم لێ بێنن‌و موشکیلەم بۆ دروست نەکەن چونکه ئەوان دەیانویست بمکـەن به بەکرێگیراوی خۆیان له دژی میللەتەکەم منیش چۆن شتی وا دەکەم.

مامۆسـتا بـەردەوام بـوو لـه گێڕانـەوەی ڕووداوەکـەو ووتـی ئـەوەبوو نوێنەری سەدام حسین منی بەجێ هێشت، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك تەلـەفۆنی بۆ کردم‌و پێی ووتم که سەدام حسین دەڵێ مادام ئـەو ئەمـه ناکـات بـا تـەنها شـتێکمان بـۆ بکـات ئـەویش دەعـوەتکردنی هاشـم ئـاکرەیی‌و مـەلا عبـدالله اسماعیل (مەلا ماتۆڕ) و عبدالسـتار تـاهیر شـەریف‌و هەنـدێ کەسـانی تـر بـۆ ئەوەی لەگەڵیان دابنیشم‌و باسی هەمان بابـەتیان لەگـەڵ بکـەم. لـه درێـژەی قسەکانیدا ووتی ئـەم داوایـەم قبـوڵکردو هـەموویانم بانگێشـتی مـاڵی خۆمـان کردو غانم عبدالجلیلیش هات‌و داوای لێکـردن چـەند حزبێکـی کـوردی دروسـت بکـەن یـەکێك لەوانـه پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان بێـت . مامۆسـتا بـه پێکەنینەوه ووتی دەزانی چاوەڕێم نەدەکرد ئەوانه وا به ئاسـانی ئـەم داوایـه قبوڵ بکەن کەچـی لـه جیـاتی ڕەفزکـردن کەوتنـه ستایشـی سـەدام حسـین‌و حزبی بەعس‌و به نرخێکی زۆر کەم قبوڵیان کرد ! !

## دیدارم لەگەڵ "خیرالله طلفاح" ی خاڵی سەدام حوسێن

لە هاوینی ساڵی ١٩٧٩ ماوەی دوو حەفتە خیرالله گلفاح ی خاڵی سـەدام حوسێن لە خانوێکی کۆمەڵەی (ز) لە هاوینەهەواری پیرمام نیشتەجێ بوو بـۆ بەسەربردنی پشووی هـاوین، جـا منـیش بـە حـوکمی ئـەوەی بەرپرسـی ئـەو خانوانە بووم تـوانیم بـە دیـداری بگـەمو زۆربـەی ئێـواران دەچـوومە لایو لـە باخچەکە لـە مەجلیسـی ئـەو دادەنیشـتم. ئێوارەیـەکیان بـۆ چارەسـەرکردنی کێشەیەکی خۆم چومەلای، هەر ئـەو ڕۆژە سـێ بـارزانی دانیشـتووی ناحیـەی قوشتەپە هاتنە لایو بە ناوی خۆیانو بارزانیەکانی دانیشتووی قوشتەپە کـە بە زۆرە ملێ بۆ ئەوێ دوور خسـترابوونەوە هەنـدێك داواکاریـان پێشکەشـکرد سەبارەت بە خراپی باری ژیانو گوزەرانیان. ئەویش ووتی بـەیانی بـە بۆنـەی گواسـتنەوەی بەهائـەددین ئەحمـەد لـە پۆسـتەکەیو هـاتنی یحـی جـاف بـۆ شـوێنەکەی وەك پارێزگـاری هـەولێر خـوانێکی نـانی نیوەڕۆیـان لـە هـوتێلی هــەورامان ئامــادە کــردووەو منــیش دەعــوەت کــراومو هــەموو بەرپرســە گـەورەکانی ئێـرە لـەوێ ئامـادە دەبـن بۆیـە ئێـوەو چـەند کەسـێکی تـر کـە نوێنەرایەتی هەموویان بکەن بۆ نیوەڕۆ لەوێ ئامـادەبن بۆئـەوەی ڕاسـتەوخۆ داوا لەو بەرپرسانە بکەم بزانم چیان بۆ ئێـوە پـێ دەکرێـت. ڕووی لـە منـیش کردو ووتی تۆش وەرە بۆ ئەوێ تۆ دەعوەتی منی لەم خوانە. جا ئەوەبوو بۆ بەیانیەکەی ئامـادەی خوانەکـە بـووم لـە هـوتێلی هـەورامان گشـت بەرپرسـە باڵاکـانی ئـەوکاتی مەجلیسـی تـەنفیزیو تەشـریعیو تەنانـەت قائیـد فرقـەی هەشت کە تکریتی بوو هەروەها بەڕێوەبـەری پۆلیسـی هـەولێر شـیخ جـەمال ئەتروشیش لەوێ بوون، خیرالله گلفاح دەستی گرتمو منـی لـە تەنیشـت خـۆی داناو دواتر بارزانیەکانیش هاتن ژمارەیـان حـەوت کـەس بـوو دوای خـواردنی نانی نیوەڕۆ لە سـاڵەیەك دانیشـتینو بـەدەم چـاو میـوە خواردنـەوەڕووی لـە گشـت بەرپرسـەکان کـردو ووتـی ئـەم بارزانیانـە لـە زروفێکـی مەعیشـی زۆر

خراپدان له قوشتەپە لەناو خێمەدانو زستان بێت نقومی ژێر ئاو دەبنو هیچ کارو کاسبییێکیشیان نیە بزانین ئێوە چیتان پێ دەکرێ بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانیان؟ شیخ بەشیر ئەتروشی ئەمینداری گشتی ئەوقاف ووتی فەرمانگەکەی ئێمە تەنها هی مەلاو پیاوانی ئایینیە، ئەگەر مەلاو پیاوی ئایینیان هەبێت بۆیان دادەمەزرێنین. بارزانیەکان ووتیان تەنها دوو سێ فەقێمان هەیە. خیراللە گلفاح ووتی جا چۆن بەوەندە کەسە میشکیلەی ئەم ژمارە زۆرەی ئەوان چارەسەر دەبێ. شیخ جەمال ئەتروشی بەڕێوەبەری پۆلیسی شاری هەولێریش ووتی فەرمانگەکەی منیش تایبەتە بە پۆلیس ئەگەر بیانەوێ ئەوەی مەرجی تیابێت دایان دەمەزرێنین بە پۆلیس. قائیدی فرقەی هەشت کە تکریتی بوو ناوەکەییم لەبیر نەماوە نەیهێشت بەرپرسەکانی تر وەڵام بدەنەوە بە تووڕەییەوە ووتی ئەوانە موخەریبنو موستەحەقی هیچ نین با بمرن. حاجی خیراللە زۆر تووڕە بوو ڕووی کردە قائیدی فرقەو ووتی بەخوای هەتا سەدام حسین ڕاوێژکاری وەکو ئێوەی هەبێت حاڵی باش نابێت، ئەوانە موخەریب نین ئێوە بە زۆری دەیانکەنە موخەریب چونکە زوڵمیان لێ دەکەنو هیچیان بۆ ناکەن. ڕووی لە بارزانیەکان کردو ووتی لەوانە بگەڕێن ئەوان هیچ چارەسەرێکیان بۆ موشکیلەکانی ئێوە پێ نیە بەڵکو ڕقیشیان لێتانە، دەچمەوە بەغداو خۆم سەدام دەبینمو پێی دەڵێم کێشەکانتان چارەسەر بکات.

**دیدارم لەگەڵ مەلا ماتۆڕ**

هـەر لـە سـاڵی ١٩٧٩ عبـداالله اسماعیـل ناسـراو بـە مـەلا مـاتۆڕ بـە نوێنەرایەتی سەرۆك كۆماری عێـراق سـەدام حسـین هاتـە شـاری هـەولێرو لـە هاوینە هەواری پیرمام میوان بوو. ئێوارەیەك بۆ گواستەوەی وەزیفەی براكەم فارس سەعدی لە فەرمانگەیەكی پارێزگای ئـەنبار بـۆ شـاری هـەولێر چـوومە لای. ڕەشمـاڵێكی گـەورەی لـەناو حەوشـەی خانووەكـەی هەڵـدابوو، سەماوەرێكی دانابوو قۆرییێك چای لەسەر بوو، لەولاوەش لەگەڵ كەسێك یاری دامەی دەكرد. سەرەتا نەمناسی، ئەوانەی دامـەیان دەكـرد بـە جـلو بـەرگی كوردیەوە بوون، هەروام زانی پاسـەوانی ئـەون، بۆیـە پرسـیم هاتوومەتـە لای جەنابی وەزیر (ئەوكاتە ئەو وەزیری دەوڵەت بوو) یەكێكیان ڕووی تێ كـردمو ووتی فەرموو دانیشەو بزانم چیت دەوێ ووتم هاتوومەتە لای جـەنابی وەزیـر، ووتی من هەوم فەرموو. ڕاستی گومانم هەبوو كە خۆی بێت بەڵام هەر داواكەم لێـی كـرد بـۆ گواسـتنەوەی گواسـتنەوەی براكـەم و ووتم براكـەم لـە لایـەن جێگـری سـەرۆكی ئەنجومـەنی وەزیـران تـەها جەزراویـەوە بـە مەركـەزی دامەزراوە بۆیە تەنها ئـەو یـان سـەرۆكی كۆمـار دەتـوانێ بیگوازێتـەوە. هـەر ئەمەم ووت جرتێكی گەورەی كێشاو ووتی تڕحێو تـۆ بـە هەڵـە هاتوویتـە لای من! ! منیش بە داوای لێبووردنەوە ووتم دیارە من بە هەڵە هاتوومەتە لای تۆ بەڵام من جەنابی وەزیرم دەوێ كە نوێنەری سەرۆك كۆمارە. بـە پێكەنینـەوە ووتی من وەزیری دەوڵەتمو نوێنەری سەرۆك كۆمارم بەڵام هیم پـێ نـاكرێ بـۆ تـۆ چـونكە ئێمـە حـەوت وەزیـری دەوڵـەتینو لـە نهـۆمێكی وەزارەتـی نەخشەكێشانو پلاندانان هەریەكو دوو ژووریان پێ داوینو مەگەر لەبۆنـەكان دوور بە دوور یان لە شاشەی تەلەفزیۆنەوە سەدام حسین ببینین، ڕەنگـە تـۆ وەك هاوڵاتییێك داوای چاوپێكەوتنی بكەی و بە ئاسانتر ببینی.

## شەڕی ناوخۆ ...خۆسووتانی نووسەران و ڕۆشنبیران و هونەرمەندان

دوای ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ هەرزوو هێزەکانی حکومەتی بەعس زۆربەی شارو شارۆچکەکانی کوردستانی گرتەوە بەڵام نەیتوانی بەیەکجاری لەو شوێنانە بمێنێتەوە بۆیە ڕژێم لەژێر فشاری هێزی جەماوەری کوردستان و پێشمەرگە لە ڕێکەوتی ١٩٩٢/١٠/٢ ئیدارەی خۆی لە هەرسێ پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان کێشایەوەو جارێکی تر ئەو پارێزگایانە ئازادکرانەوەو بەرەی کوردستانی لە ماوەیەکی گونجاودا هەڵبژاردنی بۆ پێکهێنانی یەکەم پەرلەمانی هەڵبژێردراوی جەماوەری خەڵکی کوردستان سازداو دواتریش لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە وەك دوو هێزی براوە حکومەتی هەرێمی کوردستانیان بەشێوەی فیفتی فیفتی پێکهێنا بەمەش بەشێوەیەکی گشتی خەڵکی کوردستان دابەش بوو بۆ بەرەی زەردو بەرەی سەوز تەنانەت هەر لە یەکەم چرکەساتی بانگێشەکانی هەڵبژاردن و تا دوای هەڵبژاردنیش بووە شەڕە پەڕۆ لە نێوان دۆست و لایەنگرانی هەردوو حزبەوەو تەنانەت دوای پێکهێنانی حکومەتیش حزبایەتییان بەشێوەیەکی وەها قوڵکردبۆوە کە هیچ بوارێك بۆ کوردایەتی نەمابۆوە، هەربۆیە لەپێناو فراوانکردنی دەسەڵاتەکانیان هەردوولا باوەشیان بۆ کەسانی باش و خراپ کردەوەو بەمەش زەمینەیان خۆشکرد بۆ هاتنەناوەوەی کەسانی خاوەن ڕابردووی خراپ تا لە ئاکامدا لە شەڕە پەڕۆوە بووە شەڕی ڕاگەیاندن و دواتریش بە شەڕی چەکداری کۆتایی هات، بەمەش سەروگیان و ئاسایشی گشت خەڵکی باشووری کوردستان کەوتە مەترسیەوە.

زۆر هەوڵ و تەقەلا درا لەلایەن پیاوماقوڵان و کەسایەتی و نووسەرو ڕۆشنبیران و هونەرمەندانەوە بۆ ڕاگرتنی ئاگری شەڕی براکوژی بە زوویی بەڵام بێ سوود بوو. هەر لە میانی ئەو هەوڵ و تەقەلایانەشدا ئێمە چل و نۆ

نووسـەرو ڕۆشـنبیرو هونەرمەنـد کـە مـن‌و بەشـێکی ترمـان لـە هـەمان کاتـدا ئەندامی کۆمەڵەی مافخوازانی مافی مرۆڤ بووین، لە بارەگای ڕۆژنامـەی ئـاڵای ئـازادی کـە حزبـی زەحمەتکێشـانی کوردسـتان دەری دەکـرد، لەڕێکـەوتی ١٩٩٥/١/٢٠کۆبووینــەوەو بەرهەمــە ئەدەبیــەکانی خۆمانمــان وەك نــاڕەزایی سووتاندو وەبیرخەرەوەیەکیشمان دەرکرد کە ئاراستەی هەردوو بەڕێزان مـام جەلال تاڵەبانی‌و کاك مەسـعود بارزانیمـان کـردوو وێنـەشمان دابـووە یـوئێن‌و سەرجەم حزبە کوردستانیەکان‌و لایەنی پەیوەندیـداری تـرو تیایـدا ئامـادەیی خۆمـان پیشـاندابوو کەڕێکـەوتی١٩٩٥/٢٤ لـە کاتـژمێری دووی پـاش نیـوەڕۆ لەبەردەم پارێزگـای هـەولێر خۆمـان دەسـووتێنین ئەگـەربێت‌و ئـەم شـەڕە ڕانەگرن. ئەمەی خوارەوەش دەقەکەیەتی:

( بەڕێزان: مام جەلال‌و مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردسـتان، بـەڕێزان کـاك مەسـعودو مەکتــەبی سیاســی پــارتی دیمـوکراتی کوردسـتان– یەکگرتوو. ئێمە کۆمەڵێك ڕووناکبیرو هونەرمەنـدانی هـەولێر کـە لـە خـوارەوە ئیمزامـان کـردووە ڕۆژی هـەینی ١٩٩٥/١/٢٠ لــە کۆبوونــەوەی خۆمانـدا لــە بارەگای ڕۆژنامەی ئـاڵای ئـازادی بڕیارمانـدا کـەوا ڕۆژی سێشـەممە ڕێکـەوتی ١٩٩٥/١/٢٤ کاتژمێر دووی پاش نیوەڕۆ لەبەردەم گۆڕەپانی پارێزگای هەولێر بە کۆمەڵ خۆمان بسـووتێنین ئەگـەر ئـەم داخوازییـەمان تـا کـاتی دیـاریکراو جێبەجیٚ نەکەن:

١– ڕاگرتنی شەڕ بەیەکجاری لەسەرتاسەری کوردستان.

٢– دانیشتنی هەردوو لاتان‌و گرتنەبـەری ڕێگـەی ئاشـتیخوازانەو گفتوگـۆ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان.

٣– ڕەچـاوکردن‌و پێڕەوکردنــی بەنـدەکانی مـافی مـرۆڤ وەك چـۆن لــە جاڕنامـەی گـەردوونی مـافی مرۆڤـدا هـاتووە، هـەر هـەمووی لـە کوردسـتاندا پێشێل کراوە.

٤- ڕاگرتنی ئەنفالی کوردی لەلایەن هەردوولاتان بەرامبەر یەکترو بەرامبەر خەڵك.

٥- بەتەنگەوەهاتنی هەردوولاتان بۆ داخوازییەکانی حزبە کوردستانیەکانو ئاشتیخوازان.

٦- دەست تێکەڵ نەکردن لەگەڵ ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستانو بە تایبەتیش ڕژێمی بەغدای دیکتاتۆر، کە ئێستا بە نیازە خۆی بخزێنێتە گۆڕەپانەکەوە.

٧- ئیلتزامکردن بە پرۆژەی ٩و١٩٩٥/١/١٣.

٨- ئیلتزامکردن بە ڕێکەوتننامەی پاریس.

چاوەڕوانی وەڵامی بەپەلەتانین لەگەڵ ڕێزماندا). ئەوانەی ئیمزایان کردووە: (کەمال غەمبار، غەفور مەخموری، تاریق جامباز، کەریم شارەزا، سلیمان شاکر، عومەر شێخەللاّ دەشتەکی، کمال سعدی مستەفا، عبدالرحمن پیرداود، مدحت بێخەو، محمد اسماعیل، سۆزان مامە، گۆران جلال، فریدون سامان، عبدالکریم سەرکەش، بێکەس حمد قادر، ادریس شەیداهۆ، تحسین محسن، سرکوت رسول، د.شکریە رسول، هەردی حسین، نهاد جامی محمد، لاوکو احمد، د.فرهاد پیربالّ، فیصل دێهاتی، فریاد حسن هێرانی، خالد عوسمان، ڕابەر ڕەشید، خالد حەلاق، پەروەر ئەسعەد، انور سلیمان، مولود بێخاڵی، مهداوی ڕەشید، ئاسۆ حەسەن، حمەکریم هەورامی، صباح ڕەنجدەر، مجید ئاسنگەر، فریدون حسن، ماردین حسین، جمیل سنجاوی، سربست عمر، خالد کۆچەر، تحسین فایەق، خاڵە حەمرین، ئازاد عبید صالح، یوسف عوسمان، غازی حسن).

ئەوەبوو ئێوارەی ڕۆژی سێشەممە ڕێکەوتی ١٩٩٥/١/٢٤ سەعات دووی پاش نیوەڕۆ، هەموومان بەڕۆیشتنی پیادەوە چووینە بەردەم پارێزگا بۆ خۆسووتاندن، بە هەزارەها کەس لە دەورمان کۆبووبوونەوەو بە تێکڕا

هوتافـاتی جیاجیایـان لیّ دەداو نـەفرەتیان لـە شـەڕی نەگریسـی براکـوژی دەکردو داوایان لیّ دەکردین کە لە بڕیارەکـەمان پەشـیمان ببینـەوەو خۆمـان نەسووتێنین، بەڵام ئێمە بڕیارێك بوو دابوومانو لێی پەشـیمان نەدەبووینـەوە هەرچەندە ژیانیشمان زۆر خۆشدەویست بۆیە بە ئومێدەوە چاوەڕێی وەڵامـی هـــەردوو بـــەڕێزانمان دەکـــرد بـــۆ ڕاگرتنـــی شـــەڕ، لەولاشـــەوە تیمـــەکانی ئاگرکوژێنەوە لەوپەڕی ئامادەباشیدابوون بۆ کوژاندنەوەی ئێمە لـە حاڵـەتی خۆسووتاندنمانو ڕۆژنامە نووسانی ناوخۆییو بیانیش لەو ناوە بڵاوببوونەوەو ووتەیان لەمو لەو وەردەگرتو ئەو دیمەنە تراژیدیایەیان بـۆ نـاوەوەو دەرەوە دەگواستەوە.

بەهەرحاڵ، بە گەیشتی دوو بروسکە لەلایەن مام جـەلالو کـاك مەسـعود بـــارزانی کەتیایـــدا بـــە دەنـــگ داخوازییەکانمانـــەوە هـــاتبوون، پرۆســـەی خۆسووتاندنەکە هەڵوەشایەوەو ئێمەش بە دڵێکی خۆشو بەئومێدەوە بـەرەو ماڵەوە گەڕاینەوە.

ئەمەی خوارەوە بروسکەی هەردوو بەڕێزانە:

**یەکەم: بروسکەی بەڕێز مام جەلال تاڵەبانی**

بەڕێزان...ئـــەدیبو هونەرمەنـــدانی کوردســـتان، ئەوانـــەی لـــە بارەگـــای ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی دا کۆبوونەتەوەو پرۆژەیەکتان پێمان داوەبە سلاوێکی برایانـەی گـەرم... ڕەزامەنـدی خۆمتـان لەسـەر هـەموو داخوازیەکانـدا پێکـڕا دەگەیـەنم وە بۆتـان دوپـات دەکەمـەوە، کـە یـەکێتی نیشـتمانی کوردسـتان ئامادەیە:

١- دەسـت بـەجیّ شـەڕ لـە سەرانسـەری کوردسـتان ڕابگرێـتو لیژنـەی چـاودێری شـەڕ ڕاگـرتنیش هـەبێت لـە نوێنـەرانی حزبـە کوردسـتانیەکانو پەڕلەمانو (INC).

٢- ڕێگـەی ئاشـتیو سیاسـی بگرینەبـەر بـۆ چارەسـەرکردنی هـەموو کێشەکان.

٣- التزامی تەواو بە پڕۆژەی ٩و١٣ی/١/١٩٩٥.

٤- التزام کردن بە ڕێککەوتنامەکەی پاریس.

٥- ڕیزگرتن لە دیموکراسیو مافی مرۆڤ لە هەموو کوردستاندا.

٦- دەست تێکـەڵ کـردن لەگـەڵ ڕژێمـە داگیرکـەرەکانی کوردسـتان بـە خیانەتی نیشتمانی گەورەو تاوانی هەرە پیس دادەنێین. هەر لایـەنێك بیکـات شایستەی نەفرینی کوردایەتیو مرۆڤایەتیو مێژوویو کوردو کوردستانە.

٧- هــەموو بڕیارەکــانی پەرلــەمانی کوردســتان دەربــارەی ئاســایی کردنەوەی وەزعەکە جێ بە جێ بکرێن، بە چەك داماڵین لـە شارەکانیشـەوە، بە دوورخستنەوەی هێزی چەکدار لە شارەکانیش بە گەڕانـەوەی داهاتـەکانی گومرگـەکانیش بـۆ حکومـەتی هـەرێم و جـێ بـەجێکردنی هـەموو یاسـاکانی پەرلەمانیش.

هــەڤالآن خوشــكو برایــانی خۆشەویســت ئــەدیبو هونەرمەنـد هەقــە هەڵوێســتیان هــەبێت هەرکەســێك.. لایــەنێك پێشــوازی دڵســۆزانەی لــە داخوازیـەکانی گـەلو پەرلـەمانو ئێـوە مانـان نـەکرد هەقـە دەسـت نیشـان بکرێتو ریسوا بکرێت.

ئیتر هەر شادو سەرکەوتووبنو هەربژین

برای دڵسۆزتان مام جەلال ١٩٩٥/١/٢٤

**دووەم: بروسکەی کاك مەسعود بارزانی**

بۆ برایانی بەڕێزو ڕوناکبیرو هونەرمەندانی هەولێر

سلاّوێکی گەرم

بیرخەرەوەی بەڕێزتانم بەدەست گەیشت دیارە ئێوەش ئاگاداری ئەوەن هیچ وەختێك لەگەڵ شەڕدا نەبووین، وە هەمیشە ئەوەی کرابێ لەم پێناوەدا درێغی لێ نەکراوە لەلای ئێمەوە، بەلاّم هیواداریشم بەڕێزتان لەوەش ئاگادارین کە:

١- ئێمە لەشکر کێشیمان نەکردوە بێینە شاری هەولێر بەو چەشنەی کە بە چاوی خۆتان دەبینن داگیری بکەین. بە پێچەوانەوە هێرشمان بۆکراوە، وە بەرگریمان لە خۆمان کردوە.

٢- دڵنیاتان دەکەینەوە ئەگەر هێرشمان بۆ نەکرێ لە هەڵوێستی بەرگری زیاتر وەرناگرین.

٣- لەگەڵ ڕێزو پێ زانینمان لە ئاست هەڵوێستی نیشتمان پەروەری ئێوەدا. ئێمە پێمان وایە کە کلیلی ئاشتی لە کشانەوەی بێ قەیدو شەرتی هێزەکانی ناو شاری هەولێرو گەڕانەوەی شار بۆ دۆخی ئاساییدا.

لەگەڵ ڕێزماندا

مەسعود بارزانی ١٩٩٥/١/٢٤

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، وێڕای ئەو بەڵێنانەی کە دابوویان کەچی شەڕ نەوەستا بەلاّم هەوڵو تەقەلاّی کوردستانیان بە ئێمەشەوە هەر بەردەوام بوو بەلاّم بە شێوازی جیاجیا تا لە کۆتاییدا لەژێر فشاری دەرەکی بەتایبەتی ولاّتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا شەڕ ڕاوەستا بەلاّم کوردستان بۆ دوو ئیدارەی حوکمڕانێتی دابەش بوو کە ناوچەکانیش بە زۆنی سەوزو زۆنی زەرد ناوزەدکرا، ئەم واقیعە هەروا مایەوە تادوای روخانی ڕژێمی عێراق لەلایەن ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانەکانیو بەبەشداری پارتیو یەکێتیشەوەو دواتر ئەم دابەشبوونە وردە وردە کاڵ بۆوە تا هەردوو پارتی دەسەلاّتدار لە ساڵی ٢٠٠٥ لە کابینەی (پێنجەم ) ئەگەر بە شێوەیەکی ڕواڵەتیش بێت یەکیان گرتەوە.

## دیدارم لەگەڵ نوێنەرێکی پارتی کرێکارانی کوردستان

لەساڵی ١٩٩٤ برادەرو هاوکارم پارێزەر (م.ص.عمادی) لە ژووری پارێزەرانی هەولێر هاتە لام‌و داوای لێکردم کە کاتێکی بۆ دیاربکەم کە بەیەکەوە دابنیشین بۆ باسکردنی بابەتێکی تایبەتی. ئەوەبوو ڕێککەوتین کە لە ماڵی ئێمە لە گەڕەکی موفتی دوای نوێژی شەوان ئەو دیدارە ئەنجام بدەین. جا ناوبراو هاتە ماڵمان‌و لە ژوورێك بە تەنها تا درەنگی شەو دانیشتین‌و پێشەکی زۆر بە درێژی باسی پارتی کرێکارانی کوردستان‌و چالاکیەکانی لە کوردستان بۆ کردم، دواتر باسی ئامانجە نیشتمانی‌و نەتەوایەتیەکانی ئەو حیزبەی بۆ کردم‌و تیشکی خستە سەر ئەوە کە ئامانجی سەرەکیان لە خەباتی سیاسی‌و چەکداری ئازادکردنی کوردستانی گەورەیە لەگەڵ یەکخستنەوەی هەر چوارپارچەکانی بەتایبەتی باشوورو باکوری کوردستان. دواتر باسی لە بیرۆکەی دامەزراندنی حزبێکی نوێ کرد لە باشووری کوردستان بە ناوی (یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی کوردستان کە کورتکراوەکەی ی.ن .د.ك) ە، هەر بەو بۆنەیەوە داوای لێکردم کە لەلایەن پارتی کرێکارانی کوردستانەوە ڕاسپاردراوە بۆ بەشداریکردنم لە دامەزراندنی ئەو حیزبەدا کە نیازە بارەگایەکەی لەسەر شەقامی شەست مەتری بێت‌و چەند کەسایەتییێکی دیاری شاری هەولێر بەشداری تیادا دەکەن. منیش لە ناوی هەندێ لەو کەسانەم پرسی، برای بەڕێزم غەفور مەخموری یەکێك بوو لەو ناوانە کە دەمێکە لە نزیکەوە دەیناسم. ووتم سەبارەت بە ئامانج لە دروستکردنی ئەو حیزبە دەتوانی شتێکم بۆ ڕوون بکەیتەوە؟ ووتی بۆ نا؟ ئەوەبوو بە دوورو درێژی بۆی ڕوون کردمەوە، کە نەهێشتنی دەسەڵاتی هەردوو حزبی (پ.د.ك) و (ی.ن.ك) لە باشووری کوردستان لە ئەولەویەتی کارەکانیان بوو.جا لەبەر ئەوەی ئەو جۆرە ئیشکردنەم بۆ ئەو جۆرە ئامانجە بەلاوە خۆش نەبوو، بۆیە داواکاریەکەیم ڕەتکردەوە. بەلام بەڕێزیان زۆر

هەوڵیدا قەناعەتم پێ بێنێ بەڵام بێ سوود بوو. کە زانی ئامادەنیم لە دامەزراندنی ئەو حیزبە بەشداربم، داوای لێکردم کە لە ئەوروپا کاریان لەگەڵ بکەمو ئامادەیی خۆیانی پیشاندا کە خۆمو خانەوادەکەم بگەیەننە ئەو دەوڵەتەی کە ئیشی تیادەکەمو تەنانەت بەڵێنی دا کە بژێوی ژیانیشم لەسەر ئەوان بێت. بە هەرحاڵ نەگەیشتینە ڕێککەوتن، بەم چەشنە کۆتاییمان بە دانیشتنەکە هێنا.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، هەر لەو ماوەیەدا حیزبەکە بە هەمان ناو دامەزراو ئەو کەسانەی کە ئەو ناوی هێنابوون بەشداربوون لە دامەزراندنی، بەڵام دوای ماوەیەك هەندێك لە دامەزرێنەرانی ئەو حیزبە ئینشقاقیان کردو حزبێکی تریان بە هەمان ناونیشانەوە پێکهێناو دواتر دوای شەڕی پەکەکەو لایەنێکی سیاسی لە باشووری کوردستان ئەو حزبەی کە سەر بە پەکەکە بوو بەیەکجاری لەبەرچاو وون بوو.

### داوام لێکرا بەشداربم لە دامەزراندنی بزووتنەوەی میللی

مامۆستا عبدالخاق زەنگەنە یەکێك بوو لەو کەسایەتیە سیاسیانەی گۆڕەپانی سیاسی کوردستان کە دوای ڕاپەڕین ناسیم. لە ڕاستیدا مامۆستا پەیوەندی لەگەڵ عومەراغای سورچی زۆر باش بوو، زوو زوو سەردانی دەکرد جا کاتێك منیش ئەندامی سەرکردایەتی پارتی پارێزگارانی کوردستان بووم ئاشنایەتیم لەگەڵی پەیداکرد. سەرەتا لەسەر داوای بەڕێزیان بەشداریمکرد لە کۆمەڵەی مافخوازانی مافی مرۆڤ لە کوردستانو لە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٦ هەر لەسەر داوای بەڕێزیان بەشداریم کرد لە دامەزراندنی کۆمەڵەی عێراقی بۆ مافەکانی مرۆڤ. دوای ئینشقاقکردنی لە حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان، پەیوەندیمان لە ڕێگەی ئەو دوو ڕێکخراوەیەوە هەر مابوو، تەنانەت زۆرجاران لە ماڵەکەی خۆی لەخانووی وەزیرەکان لە گەڕەکی

بەلاشاوە دەعوەتی دەکردین. جا ئـەوەبوو دوای ماوەیـەك لـە کۆتـایی سـاڵی ١٩٩٦بەدوای ناردمو بەیاننامەیەکی دامیّو پێـی ووتم کـە نیـازی دامەزرانـدنی بزووتنەوەیەکی هەیە بەناوی (بزووتنەوەی میللی کوردستان)بۆیە حەزدەکات لە دامەزراندنیدا لەگەڵیان بەشداربم. منیش ئەو کاتە بڕیارم دابوو لـە چـالاکی سیاسـی خـۆم دووربخەمـەوە بۆیـە بەرلـەوەی بەیاننامەکـە بخوێنمـەوە، ڕای خۆمم پێی ووت، بەڵام ئـەو پێـی ووتم کـە ئـەو بزووتنەوەیـە بزووتنەوەیـەکی سیاسی نیـەو هـیچ ئایـدیۆلۆجییێکی نیـە. منـیش دوای ئـەوەی بەیاننامەکـەم خوێنـدەوە پـێم ووت مامۆسـتا عبـدالخالق ئـەم بزووتنەوەیـە ئەگـەر سیاسـی نەبێت ئەی چی سیاسیە ! ! بەپێی ئەم بەیاننامەیە بێت پڕە لـە ئایـدیۆلۆژیاو تەنانەت زیاتر لە ئایدیۆلۆژییێکی تیایە بۆیە داوای لێبووردن دەکەم.

## مەلا مستەفا بارزانی و وەرگرتنی روتبەی جەنەراڵ

ڕەئیس بەکر حەوێزی زاوای مام جەلال و کۆنە سەرکردەی سوپا لە کۆماری مەهاباد لە ساڵی ۱۹۹۳بۆی گێڕامەوە ووتیکاتێك کۆماری کوردستان لە شاری مەهاباد ڕاگەیاندرا، من یەکێك بووم لە بەشداربووانی ئەو کۆمارەو پەیوەندییەکی زۆر باشم هەبوو لەگەڵ مەلافستەفاو شێخ ئەحمەدی براگەورەی بارزانی. ووتی کاتێك قازی مەحەمەد مەرسومی کۆماری دەرهێنا بە بەخشینی پلەی سەربازی بۆئەوەی هێزی پێشمەرگە ببێتە هێزێکی نیزامی، ئەوەبوو هەموومان جلوبەرگی سەربازیمان لەبەرکردو روتبەکانمان بەست، تەنها مەلا مستەفا نەبێت کە روتبەی جەنەراڵی لەلایەن قازی مەحەمەدەوە پێ درابوو لە ترسی شێخ ئەحمەدی کاکی جلو بەرگی سەربازی لەبەر نەکردو روتبەکەشی نەبەستبوو، بۆیە من پێم ووت تازە هیچیتر نابێ بە جلوبەرگی کوردیەوە چەك هەڵبگریت چونکە ئێمە دەوڵەتینو دەبێ سوپای نیزامیمان هەبێت ، بۆیە ئەو جلوبەرگە سەربازیە لەبەربکەو روتبەکەشت ببەستەو لەگەڵم وەرە دەیکەینە موفاجەئە بۆ شێخ ئەمەد، سەرەتا من دەچمە ژوورەوەو دوایی پاش ئەوەی ڕەزامەندی وەردەگرم ئەوجا تۆش وەرە ژوورەوە. ووتی جا ئەوەبوو بەقسەی منی کردو بەیەکەوە چوینە ماڵی شێخ ئەحمەد، سەرەتا من چوومە ژوورەوەو وتم شێخ وابزانم تۆ خاتری منت زۆر دەوێ، ئەگەر داوایەکی قورست لێ بکەم بە قسەم دەکەیت؟ ووتی تۆ ڕێزی تایبەتیت لای من هەیە بۆیە هەر داوایەکت هەیە بیڵی ڕەتی ناکەمەوە. کە وای ووت ووتم مەلا مستەفا لەبەر دەرگایەو لە ترسی تۆ نایەتە ژوورەوە، بانگی بکە بەلاّم هیچی پێ نەڵێی ئەو لەسەر قسەی من فەرمانێکی پێشەوا قازی مەحەمەدی جێبەجێ کردووە. ئیتر ئەوەبوو ووتی بابێتە ژوورەوە، بەلاّم کە بەو جلوبەرگە مەلامستەفای بینی لە چۆکی خۆی داو ووتی ئەوەشت کرد ! ! چیبکەم دەسەلاّتی ڕەئیس بەکرم نیە.

هەروەها جارێکی تر بۆی گێڕامەوە ووتی: (( بەرلەوەی دوژمن بگاتە مەهاباد قازی محەمەد کۆبوونەوەیەکی پێ کردین ئێمەو پاوماقوولان و سەرۆك عەشیرەتەکانی ئەو ناوچەیەش ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون، قازی پێی ووتین وا دوژمن خۆی کۆکردۆتەوەو بە نیازە هێرشمان بێنێتە سەر جا دەمەوێ پرستان پێ بکەم ئەگەر بەڵێنم پێ ئەدەن کە بەرگری لە کۆمار دەکەن ئەوا منیش لەگەڵ ئێوە تا مردن شەڕ دەکەم وە ئەگەر ناتانەوێ ئەمە بکەن با بزانم ئەو کات من خۆم ئەدەم بە دەستەوە با لە سێدارە بدرێم نەك خەڵك بکوژرێ؟ بەکراغە ووتی هەموو ئامادەبووان سوێندیان بە قورئان خواردو تەڵاقیان فڕێ دا کە تا مردن بەرگری دەکەن، بۆیە کۆبوونەوەکە بەوە کۆتایی هات کە لە بەیانیەوە ئەوانیش خۆیان ئامادەکەن بۆ ڕوو بەڕوو بوونەوەی دوژمن. بەڵام ئەوەی ڕوویدا ئەوەبوو بۆ بەیانی دوژمن هێرشی هێناو لەجیاتی ئەوەی سەرۆك عەشیرەتەکان بەرگری لە کۆمار بکەن بە پێچەوانەوە هەر لە شەوەوە پەیوەندیان بە دوژمن کردبوو لە پێش هێزەکانی دوژمنەوە بوون ! ! جا قازی محەمەد کە ئەم دیمەنە تاڵەی بە دووربین بینی حەپەساو ڕووی لە مەلا مستەفا بارزانی کردوو پێی ووت : خۆت و خزمەکانت بڕۆ خۆت ڕزگارکە تا دوژمن نەگەیشتۆتە ئێرە دەنا تۆش چارەنووست وەکو من دەبێت و دەکوژرێی ئەم خەڵکە جێگەی پشت پێ بەستن نیە تەنها خزمەکانت بە کەڵکت دێن خۆ بەچاوی خۆت بینیت دوێنێ سوێندیان خواردو تەڵاقیشیان فڕێدا کەچی ئەمڕۆ لەپێش دەبابەکانی دوژمن دەڕۆن؟ جا ڕەئیس بەکر حەوێزی ووتی مەلا مستەفا نەیدەویست قازی محەمەد بەجێ بهێڵێ بەڵام قازی محەمەد زۆری لێکرد و ناچاری کرد بڕوا ئەوەبوو بەخۆیەو زیاتر لە پێنج سەد کەس لە ڕووباری ئاراس پەڕیەوەوبەرەو سۆڤێت ڕۆیشت منیش گەڕامەوە عێراقو بە ڕۆژ لە چیای هەیبەت سوڵتان خۆم دەشاردەوەو بە شەویش دەگەڕامەوە ماڵێ .

## موخابەراتی عێراقی دووجار ویستی بمخاتە سەرخەتی خۆی

**جاری یەکەم :**

دوای ئەوەی هاوسەرەکەم تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بوو، لە هەولێر چارەسەر نەکراو سەرەتا چوین بۆ شاری موسڵ بۆلای دکتۆر قەحتان کە پسپۆری نەخۆشیەکانی شێرپەنجە بوو، ئەویش ڕەوانەی بەغدای کردین بۆ لای دکتۆر عبد علی کە هەمان پسپۆری هەبوو بەلاّم بە حوکمی شوێنەکەی لە نەخۆشخانەی نەوەوی‌و ئەو ئامێرە باشانەی کە هەیانبوو. جا نەخۆشی هاوسەرەکەم کاریگەرییەکی زۆری کردبووە سەر دڵ‌و دەروونم، چونکە مناڵەکانم ئەوسا ساوابوون بۆیە ناچاربووم هەموو کاتم بۆ ئەو تەرخان بکەم. بۆ ئەم مەبەستە سەرەتا وازم لە کاری سیاسی هێناو دەستم لە پارتی پارێزگارانی کوردستان هەلگرت‌و ئەو لێبووردنە گشتییەی کە لەلایەن ڕژێمەوە دوای ٣١ ئاب دەرچوو قۆستمەوە بۆئەوەی بتوانم بێ ترس سەردانی بەغدا بکەم‌و یاوەری خێزانەکەم بم کە زوو زوو بەشێوەیەکی دەوری دەبوایە بچینە نەخۆشخانەی ناوبراو.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، ڕۆژی ١٩٩٧/٩/٥لە شەقامی سەعدون لە بەتاوین لەگەڵ هاوسەرەکەم دەگەڕاینەوە هۆتێل سەرەڕش کە لێی دابەزیبووین ئەوکاتە، بە دەم ڕێگاوە چاوم کەوت بە برادەرێکم کە خەڵکی شاری هەولێر بوو بەلاّم دوای کشانەوەی ڕژێم لە شاروشارۆچکەکانی کوردستان هاتبووە بەغدا، ئەو برادەرە دەعوەتنامەیەکی دامێ بۆ ئامادەبوون لە میهرەجانێکی شیعر خوێندنەوە کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری کوردی لە بارەگای کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردییەوە لەوەزیریەلە ڕۆژی ١٩٩٧/٩/٦ بەڕێوەدەچێت لە ژێر ناونیشانی (الذکری الاولی لملحمة اب المتوکل علی الله) . جا ئەوەبوو بۆ ئێوارەی ڕۆژی دواتر کاتژمێر شەش‌و نیو ئامادەی میهرەجانەکە بووم کە کۆمەڵێکشاعیر شیعریان تیا

خوێندەوە لەوانە خەسرۆ جافو محمد صدیق ڕواندزیو محەمەد بەدریو کەسانی تر، هەر لە میانی ئەو دانیشتنەدا، ابراهیم بەرزنجی کە بەڕێوەبەری کارگێڕی بوو لەو دەزگایە، هاتە لامو ئامـاژەی بۆ کەسێك کرد لە ناو ئامادەبوانو پێی ووتم ئەوە ئەبوو قەیسەو دەیەوێ خۆیت پێ بناسێنێ. منیش خۆم پێی ناساندو داوای لێکردم بۆ ڕاوێژی هەندێ بابەتی یاسایی بە تەنها لەگەڵم دابنیشێ.جا ئەوەبوو چوینە ژوورێکی لابەلاو بە دوو قۆڵی دانیشتین. بەپێی قسەکانی ئەو کەسە سەربە نووسینگەی عیزەت دووری بوو هەروەکو خۆی وای ووت، بەناوی عیزەت دووریـیەوە داوای لێکردم کە دەیەوێ بمبینێت بۆ هەماهەنگیکردن لە گەڵی. هەر لە درێژەی قسەکانیدا ووتی تۆ زۆر بەختەوەری کە خودی عیزەت دووری دەیەوێ کاری لەگەڵ بکەی من تەنها ڕای ئەوت بۆ دەگوێزمەوەو بەس هیچی تر نازانم. هەر لە میانی قسەکانیدا پرسی لە کوێ دابەزیون؟ منیش ووتم لە هوتێل سەرەڕەش. ووتی زۆر چاکە ئەوانیش هەر هی خۆمانن، باشە بەیانی کاتژمێر نۆی بەیانی لە هوتێل چاوەڕێمان بە دێینە لاتو دەتبەین بۆلای ئەو.

لە ڕاستیدا ترسو دڵە ڕاوکێ زاڵبوون بەسەرمداو لە ترسان نەموێرا هیچ بڵێم تەنها سەری خۆمم بۆی دەلەقاند. ئیتر بەم شێوەیە گەڕامەوە ناوهۆڵی شیعرخوێندنەوەکەو دوای تەواو بوونی کۆڕەکە (ع.ك) کە سکرتێری نووسینی یەکێك لە گۆڤارەکانی ئەو دەزگایە بوو هاتە لامو پێی ووتم دەمەوێ بەیەکەوەو بەتەنها هەندێ قسە بکەین بۆیە پێم باشە لەو دیوی شەقام چاوەڕێم بکەی تا کەس موتابەعەمان نەکات. جا ئەوەبوو هەرزوو زانیم ئەمەش کەمینێکی ترە بەڵام چارچیە دەبوایە لەگەڵی بگوزەرێم. دوای ئەوەی لەو دیوی شەقام یەکترمان بینی سەرەتا باسی لە هەندێ چالاکی من کرد وەك هێمایەك کە ئەوان هەرچەندە لە شاری هولێر دوورن بەڵام ئاگاداری هەموو شتێکن، دواتر هاتە سەر ئەسڵی ئەو بابەتەی کە پلانی بۆ دارێشتبوو،

ووتی من له لایەن دەزگای هەواڵگری عێراقـەوە ڕاسـپێردراوم کـە پەیوەنـدیت پێوە بکەم، من تەنها عەبدی مـەئمورم پەیوەنـدیم بـە هیچـەوەنیە تـەنها تـۆ دەگەیەنمە ئەو دەزگایە ئەگەر قبـوڵی بکـەی، تـۆ زۆر سـوودمەند دەبیـت لـە هەموو ڕوێکەوەو تەنانەت هەر لە شاری خۆشت دەمێنیتەوە تەنها لـە ڕێگـای کەسانی دیاریکراوەوە پەیوەندیت بەو دەزگایەوە دەبێت.

ڕاستی لە ترسـان ڕۆح هـاتبووە سـەری لـووتم، ووتم سووچـی ئێـوە نیـە داوای شتی وام لێ دەکەن، سووچی خۆمە کە بە لێبووردنی گشـتی حکومـەت هەڵخەڵەتاومو هاتوومەتە ئێرە، وادیارە ئێوە هەموو شتێك لەبارەی ڕابردووی مـن دەزانـنو دەتانـەوێ یـان ئیشـتان لەگـەڵ بکـەم یـان بمگـرن! ! ووتم بـا ڕاستگۆبم لەگەڵتان، من پێشتر زۆر شتم نووسیوەو دەیان چالاکیشم نواندووە کـە لەگـەڵ سیاسـەتی حکومـەت ناگونجێـت، بـەلاّم لـەوەتی ئـەو لێبووردنـە گشـتییە دەرچـووە وازم لـە هـەموو شـتێك هێنـاوەو هاتنیشـم بـۆ بەغـدا لـە ناچارییەو لەپێناوی چارەسەری هاوسەرەکەمە، بەلاّم دیسـانەوە دەیڵـێم مـن بـەو لێبووردنـە گشـتییە هەڵخەڵـەتام بۆیـە هـاتم بۆیـە موسـتەحەقی هـەموو سزایەکم تۆ دەتوانی لێرە هـەر بـەم شـەوە بمگریـت یـان بمکوژیـت کەسـیش نازانێ فەرموو ئازادبە چونکەمن ناتوانم ئەو داوایەی تـۆ جێبـەجێ بکـەم. کـە وام ووت دەمانچەکەی لەبەر پشتی دەرهێناو سواریکردو لێی نزیك کردمـەوە، وامزانی دەمکوژێت بەلاّم ئەو خستیە ناودەسـتمو پێـی ووتم فـەرموو تـۆ بـەم دەمانچەیە بمکوژە، دیارە من هەڵـەم بەرامبـەرت کـردوە وا تـۆم خسـتە ئـەم بارودۆخەوە؟ من بۆ بەرژەوەندی تۆم بوو دەنا من لەمە هیچ سوودمەند نابم. هەناسـەیەکم هاتەوەبـەرو ووتم زۆر سوپاسـت دەکـەم بـۆ ئـەم هەسـتە جوامێرییەت، بەلاّم دیسانەوە دووبارەی دەکەمەوە کە من ناتوانم ئـەم جـۆرە کارانە بکەم تەنانەت وازیشم لە کاری سیاسی هێناوە.

ئـیتر بـەم شـێوەیە دیدارەکـەمان کۆتـایی پێهـاتو منـیش بـە خـەمو پەژارەوە بەرەو هوتێل گەڕامەوەو بە ترسو لەرزەوە بە دەنگێکی نـزم، وردو درشـتی ئـەو ڕووداوەم بـۆ هاوسـەرەکەم گێڕایـەوەو پلانمـان دانـا کـە بـە هەرشێوەیەك بێت خۆمان لە هوتێل بدزینـەوەو هـەر بـەو شـەوە بگەڕێینـەوە شاری هەولێر.

شـایەنی ئاماژەبۆکردنـە، ئەوکاتـە لـە بەغـدا کارەبـا نـەبوو، بۆیەلـە هوتێلەکان لەجیاتی گلۆپ چرای نەوتییان لە ژوورەکان دادەگیرساندو وەرزی هاوین بوو زۆر گەرم بوو. هەندێ جلو بـەرگو جانتایـەکمان لـە ژوورەکـەمان جێهێشتو چوینە پرسگەو پێمان ووتن کە لەبەر گەرما ناتوانین بخەوین بۆیـە ئەمشـەو دەچـینە مـاڵی ناسـیاوێكو بـەیانی زوو دەگەڕێینـەوە چـونکە مەوعیدمان هەیە لەگەڵ کەسێك بە ناوی ئەبوو قەیس.

بەم شێوەیە بەو شەوە بە دڵە ڕاوکیو ترسو لـەرزەوە چـوینە گـەراجی نهچە و گەڕاینەوە شاری کەرکوکو بۆ بەیانیش بەرەو هەولێر بەڕێ کەوتین.

ئیتر ئەوەبوو تا ماوەیەکی زۆر نەچوومەوە شاری بەغداو تەنانەت ئەگەر لە نـاعیلاجی بچومایەش بـەلای بەڕێوەبـەرێتی گشـتی ڕۆشـنبیری کوردیـەوە نەدەچووم.

## جاری دووەم: لەلایەن بەڕێوەبەری هەواڵگری باکوور

لـە ڕێکـەوتی ١٩٩٩/١١/٢٣ نیـازی چـوونە ولاّتـی لیبیـام هـەبوو، بـە مەبەستی وانە ووتنەوە لەوێ هەروەها تەواو کردنی خوێنـدنی دکتۆراکـەم لـە لوبنـان بـە موراسـەلە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە دوو پارچـە زەویـم هـەبوو فرۆشـتم بۆئەوەی سەفەری پێبکەم، بەلاّم پاسەپۆرتەکەم بەسەرچـووبوو بۆیـە دەبـوو نوێی بکەمەوە، هەروەها پاسپۆرتیش نوێ نەدەکرایـەوە تـا ناسـنامەی بـاری کەسێتی خۆمو خانەوادەکەم نوێ نەکەمـەوە.ڕۆژێك لای قوتـابیێکم کـە نـاوی

(ب.أ) بوو كه قوتابی پۆلی چوارەمی یاسا بـوو، باسـم کـرد، ووتم تـۆ خـەڵكی پارێزگای موسڵی كەس ناناسیت بە پارە بۆمان دەربێنێت؟ لـە ڕاسـتیدا دوای كشـاندنەوەی ئیـدارەكانی حكومـەت لـە شـارەكانی كوردسـتان، فەرمانگـەی ڕەگەزنامەو باری كەسێتی هـەولێر گوێزرابـۆوە بـۆ شـاری موسـڵ، جـا وەكـو باسیان دەكرد ئەگەر یەكێكت نەناسیبایە دەرهێنـانی ئەوبەڵگەنامانـە ئاسـان نەبوو. بە هەرحاڵ، ئەو قوتابیەم (كەئێستا لە ژیان نەماوەو لە دوای ڕوخـانی ڕژێـم لــە موسـڵ كــوژرا) ئیشــەكەی زۆر ئاسـان كـرد، ووتــی خــاڵم لــەوێ ئەفسەرێكی پلە بەرزە، پێویست ناكات تـۆ خـۆت بێیـت، گشـت ناسـنامەكانم بدێ لەگەڵ وێنەكانتان، من خۆم بۆی دەبەمو هەر خۆشم بۆتان دەهێنمەوە.

جـا ئـەوەبوو بـە قسـەیم كـرد، بـەڵام ئـەوەی سـەیربوونزیكەی مانگێك تێپەڕی بێ ئەوەی بیهێنێتـەوە، لـەو ماوەیـەش مـن زۆر ئیشـمبەو ناسـنامانە هەبوو بۆ ڕاییكردنی كارەكانم، بۆیە پێم ووت واپێدەچێت پێت تەواونـەكرێت، بۆم بێنەوەو من مەمنون. ووتی مامۆستا شەرمەزارم، گشت نفوسـەكان تـەواو بووە تەنها مۆرێكی پەنجەكانی خۆتو خانەوادەكەتی دەوێ، ڕۆژێك دیاریكـە بە ئۆتۆمۆبێلەكەی خۆم دێمە دواتانو بەیەكەوە دەچینە موسڵو لەگەڵ خاڵم بە یەكتریتان دەناسێنمو وەریشیان دەگرینەوە.

لە ڕاسـتیدا، زۆر ترسـام، چـونكە هێشـتان ئـەو یادگارییەتاڵـەی بەغدام لەبیرنەچوبۆوە، بۆیە ووتم دەترسم بۆ پێش بچم سمێڵـی لەسـەردانێم، ئەگـەر دەزانــی مەترســی تیایــە بــا ناســنامەكانم بفــەوتێ باشــترە لــەوەی تووشــی كێشەیەك بم. بە دڵدانەوە پێی ووتم مامۆستا ئەگـەر بـزانم كێشـەی بۆتـۆ تیـا دەبێت چۆن شتی وا دەكەم، سوێندی بۆخواردم كە تەنها پەنجەمۆری مـاوە. جـا ئــەوەبوو بــۆ ڕۆژی دواتــر بەیەكــەوە چــوین بــۆ موســڵو هــەر لەگــەڵ گەیشتنمان بۆ فەرمانگەی ناسـنامەو بـاری كەسـی، خـاڵی بـەرەو پیرمانـەوە هـات داڵێكـی لەسەرشـان بـوو، دیـاربوو ئاگـاداركرابۆوە كـە دێینـە لای بۆیـە

یەکسەر ئێمەی برد بۆ ژوورێکو پەنجە مۆری لێ وەرگرتینو ووتی لەو بن هەیوانە هەندێك چاوەڕێ بکەن تا دەیبەمە لای بەڕێوەبەر بۆ ئیمزاکردن. ئەوەبوو لەگەڵ (ب.أ) چوونە ژوورەوە، دوای چاو چوقانێك قوتابیەکەم هاتە دەرەوەو ووتی مامۆستا بەڕێوەبەریش دەرچووی کۆلێژی یاسایەو حەزدەکات بتناسێ. لەگەڵی چومە ژوورەوە دوای بەخێرهێنان دانیشاندمو خۆی پێناساندم ووتی ناوم (مقدم محمود)ە قوتابیەکەم لەگەڵمان دانەنیشت دەمودەست چووە دەرەوە. دوو کەسی تریش بە جلو بەرگی مەدەنی لە ژوورەوە لە بەرامبەر من دانیشتبوون. ئیتر ئەوەبوو سەرەتا لە هەندێ بابەتی یاسایی پرسیو کەلە کۆلێژی یاسا دەخوێندرێن وەك هێمایەك بۆ ئەوەی کە ئەویش ئاشنایەتی لەگەڵ ئەو بابەتانە هەیە، دواتر چووە سەر بابەتێکی زۆر هەستیار کە پێشبینیم نەدەکرد، ئەویش کردنەوەی بابەتێك بوو لەسەر مام جەلال. ووتی منو مام جەلال بەیەکەوە قوتابی بووین لە کۆلێژی ماف لە زانکۆی بەغدا، دواتر من چومە کۆلێژی پۆلیسو بوومە ئەفسەری پۆلیس لە شاری کەرکوکو ئەویش بووە پارێزەر لە شەقامی ئەتڵەسو ئێواران منو چەند قوتابییێکی تر دەچوینە لای تووڕەمان دەکرد، ئەویش لە شوێنی خۆی هەڵدەستایە سەرپێو جوێنی پێدەداینو دەیووت ئێوە بۆخۆتان هەروا بکەن، ڕۆژێك دێت من دەبمە سەرۆك کۆماری عێراق ئەوکاتە خۆم دەزانم چیتان لێدەکەم.دواتر ووتی تۆ جەلال تاڵەبانیو مەسعود بارزانی دەبینی؟ منیش پێکەنیم ووتم من مامۆستایەکی زانکۆم تەنها ئیشم بە دەرسو دەوامی خۆم هەیەو ئاگاداری هیچ شتێکی تر نیمەو هەوڵیشم نەداوە بیانبینم چونکە هیچ ئیشم پێیان نەبووە.

دوای ئەم دەمەتەقێیە، یەکێك لەو دوو کەسەی کە لە بەرامبەرم دانیشتبوو، ڕووی تێکردمو ووتی حەزدەکەم یەکتر بناسین، من ئەبوو زەیدونم بەڕێوەبەری هەواڵگری باکور لە قسەکانت دیارە تۆ مرۆڤێکی باشیت

بۆیه حەزدەکەم کارمان لەگەڵ بکەیت. منیش ووتم سوپاست دەکەم بۆ ئەم متمانەیە، بەلاّم من مامۆستای زانکۆمو خەریکی بەخێوکردنی ماڵو منداڵەکانی خۆممو حەزم لە کاری وەهاش نیە، زۆر هەوڵیدا قەناعەتم پێ بکات، بەلاّم که زانی بێ سوودە، دەستی درێژکردو ووتی ئەمەش ژمارەی تەلەفۆنەکەمە با لات بێت ئەگەر هاتیتە موسڵ سەردانێکمان بکەوقاوەیەکمان لەلا بخۆوە. کاغەزەکەم لێی وەرنەگرت ووتم با ڕاستگۆبم لە گەڵت وەکوپێم گووتی من کەسێکی بێلایەنمو ناتوانم سەردانی ئێوە بکەم چونکه کەسێك من لەلای ئێوە ببینێ کێشەم بۆ دروست دەبێتو لێکدانەوەی خراپی بۆ دەکرێت، منیش توانای ئەوەم نیه بۆیه داوای لێبووردنت لێدەکەم.

ئیتر بەم شێوەیه هاتمە دەرەوەو ناسنامەکانم وەرگۆرتەوەو هەتا لە خاڵی پشکنینیش چوینه دەرەوە ڕوحم لەسەری لووتم بوو نەبادا موتابەعەمان بکەن، له ترسانیش نەموێرا هیچ لای ئەو قوتابیەم باس بکەم نەبادا زیانێکم پێ بگەیەنێت، چونکه بۆم دەرکەوت که ئەمە چاڵێك بوو بۆی هەڵکەندبووم تا لەگەڵ دەزگای هەواڵگری پێکەوەمان گرێدا.

## ئەزموونی ئەدەبیم لەگەڵ ئەدەبی تەنز

سەرەتا منیش وەکو هەر نووسەرێك بە هۆنراوەی ڕۆمانسی دەستم بە ئەدەب کردو تەنانەت یەکەم هۆنراوەشم بە ناونیشانی (کوردستانم ڕەنگینە) لە ١٩٧٣/٣/١١ داناو لە ڕێکەوتی ١٩٧٥/١١/٢٣ لەسەر شانۆی ئامادەیی کوردستان خوێندمەوە، کە ئەمەش دەقەکەیەتی:

کوردستانم ڕەنگینە
بەهەشتی سەر زەمینە
لە هەر لایەك شاخو داخ
قەدپاڵیان پڕ کانینە
سنۆبەری بەرزو درێژ
سروشت پێی گەیاندینە
بێ لە داری بەرو مێو
کە هاوتایان بۆ نینە
سەوزە گیای ناسكو درێژ
ڕایەخیان بۆ کردینە
شەهلاو هەڵاڵەو بەیبوون
چین چینیان نەخشاندینە
سەد کاشانی بەقوربان
هاوتای جوانی نینە

هەر لەو ساڵەدا هۆنراوەیەکیشم بە ناوی (نامەیەك بۆ خۆشەویستەکەم) لە ساڵی ١٩٧٥لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ بەناوی کەمال چارەڕەش بڵاوکردەوە، دوای ئەوەش تاماوەیەکی زۆر بەردەوام بووم لە دانانی شیعری کلاسیك (مەبەستم بەکێشو سەروا) بەڵام تەنها بۆ ئارەزووی خۆم ئەم کارەم دەکردو بڵاوم نەدەکردنەوە، تەنها جارێك نەبێت کە شیعرێکی ترم

لەساڵی١٩٨٤لە ڕۆژنامەی هاوکاری بە ناونیشانی دەنگ نووسان بەناوی چیایی بڵاوکردە. ئیتر لەوە بەدواوە منو سابیر ڕەشید بەڵێنمان دا واز لە شیعر بێنینو تەنها چیرۆك دابنێین، وە لە چیرۆك نووسینیشدا ڕێچکەی عەزیز نەسینم گرتەبەرو چەند کتابێکی چیرۆکم لەو ماوەیەدا بڵاو کردەوە لەوانە (شەش کورتە چیرۆکی کوردی) بە هاوبەش لەگەڵ سابیر ڕەشیدو (وون بوون)و (دەرگا)و (ترحێو)و (فەنتازیا)و ڕۆمانی (سەعید زەبۆکی لای خۆمان).

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، کەرەستەی زۆربەی چیرۆکەکانم بە ڕۆمانەکەشمەوە لە واقع هەڵێنجاوە، بۆیە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی هەر بەرهەمێکم لەو بەرهەمانە چیرۆکێکم هەیە.

کاتێك کۆمەڵە چیرۆکی وون بوونم بڵاوکردەوە، وێڕای ئەوەی دوو هەزار دانەم لێی چاپ کردبوو کەچی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لە بازاڕ نەما، چونکە چیرۆکێکم تیایدا لەسەر شێتەکان نووسیبوو هەروەها بەرگەکەیم بە وێنەی کۆمەڵێك شێتی ڕوح سووکی شاری هەولێر ڕازاندبۆوە، ئەمەش سەرنجی خوێنەرانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاو هۆی سەرەکی بوو لە گەرمکردنی بازاڕی فرۆشتنی. جا ئەوەبوو دوابەدوای بڵاوبوونەوەی کتابەکە، ڕووبەڕووی چەند کێشەیەك بوومەوە، لەوانە، جارێکیان مامۆستا محەمەد محی الدین جێگری ئەمینداری گشتی ڕۆشنبیری ناوچەی ئۆتۆنۆمی بەدوایدا ناردمو پێی ووتم دایکی فلاَنە کەسە(مەستی یەکێك بوو لەو شێتانەی وێنەی بەسەر بەرگی کتابەکەمەوە بوو) لای ئەمینداری گشتی شکایەتی کردووەو دەڵێ ئێوەو دانەری ئەم کتابە کوڕەکەی منتان شێت کردووە، بۆیە دەبێ کتابەکە لە بازاڕ بکێشنەوەو لەناوی ببەن. منیش پێکەنیم ووتم مامۆستا ئەگەر ئەوکەسە شێت نەبێت چی دەکات بە نوێژی نیوەڕۆ لەسەر شۆستەی شەقام چوار چمکی لێی دانیشتووە هەروەکو لە وێنەکەدا دیارە. ووتی خۆ ڕاست دەکەی

بەلام ئێمە چبکەین ئەگەر ناڕازی بوو؟ بە قەڵەم حوبر دەموچاوەکەیم لەسەر ئەو کتابە ڕەشکرد کە لای جێگری ئەمینداری گشتی بووو پێم ووت ئەم دانەیەی پیشان بدەو پێی بڵێ هەموو کتابەکان وا لێ دەکەم ئەوجا کەس نایناسێتەوە. جا ئەوەبوو بیرۆکەکەی بەلاوە باش بوو، ووتی پاش ئەوەی پیشانی دایکەکەی دەدەم، دواتر وەلامت دەدەمەوە. بەهەرحاڵ، بۆ بەیانی تەلەفۆنی بۆ کردمەوەو بە پێکەنینەوە ووتی ڕاست دەکەی خۆ ئەوە شێتە، کە کتابەکەم پیشانی دایکی داو بیرۆکەکەم پێی ووت، ووتی کوڕەکەتان شێت کردوومەو دەشتانەوێ ڕووشی ڕەش بکەن!!

هەر لە سەروبەندی بڵاوبوونەوەی ئەم کتابەم، مامۆستا عومەر فەرهادیو برادەرانی تر، جومعەیان بەگژەوەنامو هانیان دابوو لەبری ئەوە پارەم لێ وەربگرێ. جا ئەوەبوو ڕۆژێك کاك قادری بەرپرسی پرسگەکەمان لە دیوانی ئەمیندارێتی گشتی شارەوانیو هاوینەهەوارەکان تەلەفۆنی بۆکردم لە ژوورەکەم ووتی برۆ خۆت بشارەوە وا جومعە بەخۆیو گاشە بەردێکەوە بەژوور کەوتووەو بەدەم جوێنەوە دەڵێ لەکوێیە؟ منیش لووسو باریك خۆم دزیەوەو چوومە خۆیەتی کرێکاران کە ئەوکاتە کەریم سۆفی ئەدیبو نووسەر بەرپرسی ئەو هۆبەیە بوو، ووتم تا جومعە دەڕوا لێرە دەمێنمەوە. ئیتر تا دەوام تەواو بوو لەوێ مامەوەو ناوە ناوەش تەلەفۆنم بۆ پرسگە دەکرد بزانم چی بەسەرهات. بە هەرحاڵ کە دەوام تەواو بوو ناچاربووم لەگەڵ فەرمانبەرەکان بچمەدەرەوە، جا لە هەمووی خۆشتر ئەوەبوو بەبەردەمیەوە تێپەڕیم نەیناسیمەوە تا لە فەرمانگەکەمان دوور کەوتمەوەو لە دوورەوەش منو ئەو فەرمانبەرانەی لەگەڵم بوون متابەعەمان دەکرد، بینیم لەگەڵ قادری بەرپرسی پرسگەکەمان یەکتریان گرتووەو جوێن بەیەکتری دەدەن. منیش خۆم پێ نەگیراو گەڕامەوە دواوەو پێم ووت هەتیم ئەوە چیتە لەگەڵ ئەم پیاوە شەڕ دەکەیت، خۆ ئەو ئەم کتابەی دانەناوە بەڵکو من دامناوە. کەوام

گووت بە زەردەخەنەیەکەوە ووتی ئەوجا لۆ دەترسیٚ ی عەیب ناکەیت!!
کەوای ووت دەستم گرتو بەیەکەوە بە پیادە بەرەو بازاڕ ڕۆیشتینو بە دەم ڕێگاوە پێم ووت ئێستا تۆ چیت دەویٚ؟ ووتی تۆ دوو وێنەی منت بلاْوکردۆتەوە بۆیە دەبیٚ دوو حەقم بدەیتیٚ. منیش گوتم باشە، بردمە لای کتێبخانەی عبدالکریم بەرامبەر دایەرەی کارەبا (بازاڕی نیشتمان) و بیستو پێنج دانە کتابم لە کتابەکانم بۆی وەرگرتەوەو پێم دا ووتم لەجیاتی وێنەکەت بۆخۆت بیانفرۆشە. زۆر کەیفی هاتو خستیە بن هەنگڵیەوەو هەندێك لێم دوورکەوتەوەو گەڕاوەلامو ووتی من ئەو کتابانە چ لێبکەم کەس لێم ناکڕیٚ برسیمە لەفەی گەسم بۆ بکرە؟ جا ئەوەبوو کتابەکانم لێی وەرگرتەوەو دامەوە کاك عبدالکریمو هەر لە نزیك ئەویٚ دوو لەفەی گەسم بە نیو دینار بۆی کڕی.

هەروەها لە ساڵی ١٩٩٧ کاتێك بە یارمەتی وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان ڕۆمانی سەعید زەبۆکی لای خۆمانم چاپکرد، کەسێك لە ئەوروپا گەڕایەوە کوردستانو سەردانی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستانی کردبوو، لە نزیکەوە گلەیی لە مامۆستا فلك الدین کاکەیی وەزیری ڕۆشنبیری کردبوو. مامۆستا فەلەکیش شاکر ڕۆژبەیانی بەڕێوەبەری گشتی چاپەمەنییەکانی ناردە لای منو پێی ووتم مامۆستا دەڵیٚ کەسێکی وا لە هەندەران هاتۆتەوەو دەڵیٚ ئەم ڕۆمانە ناوو ناوبانگی منی زڕاندووەو باس لە ژیانی من دەکات. بۆیە منی ناردۆتە لاتو دەڵیٚ بەیانی دێتەوەلام چی وەلاْم بدەمەوە؟ منیش ووتم با پێی بڵیٚ با ڕووبکاتە دادگاو ئەگەر وایە داواکەی بسەلمێنیٚ. جا ئەوەبوو ناوبراو پارێزەر (وشیار ئەتروشی) گرت کە یەکێك بوو لە پارێزەرە باشەکانی ئەو سەردەم، وەزارەتیش مافپەروەرێکی خۆیانی کردە نوێنەری وەزیری ڕۆشنبیریو منیش وێڕای ئەوەی پۆلێك پارێزەری ژووری پارێزەرانی هەولێر ئامادەییان پیشاندا

بۆ بەرگریکردن لێم، بەڵام من بەباشم زانی لەو کێسەدا کە شارەزاییم لێی هەبوو بەرگری لە خۆم بکەم لەبەردەم دادگادا. جا بەم شێوەیە لەبەردەم دادگای بەرایی هەولێر لەلایەن دادوەر رئوف ڕەشید بە ئامادەبوونی گشت لایەنەکانی داوا، دادگایی کردنەکە بەشێوەیەکی ئاشکرا بەڕێوەچوو، ژمارەیەکی زۆری نوسەرانو ڕۆژنامەنووسان ئامادەی دانیشتنەکان بوون، لەوانە مامۆستا پرۆفیسۆر مارف خەزنەدارو دکتۆرە شوکریە مستەفا ڕەسولو تاریق جامبازو سابیر ڕەشیدو حوسامەددین سەرداریو چەندانی تر. لە ئاکامدا داوایەکە لەبەرژەوەندی منو وەزارەتی ڕۆشنبیری یەکلابۆوە.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، کاتێك لە ساڵی ١٩٩٩ کۆمەڵە چیرۆکی تڕحێوم بلاٌوکردەوە، لەنێوەندەکانی ڕۆشنبیری بە تایبەتی شاری هەولێر دەنگی دایەوە، تەنانەت جارێك لەلای هاوڕێی مافپەروەرم شاکر ڕۆژبەیانی لە ئۆفیسەکەی لە بەڕێوەبەرێتی گشتی چاپەمەنیەکان دانیشتبووم، مامۆستا فلك الدین کاکەیی کە ئەو کات وەزیری ڕۆشنبیری بوو، بە سەردانێك هاتە ئەوێو منی لای کاك شاکر بینیو ووتی دەزانی تڕحێوەکەی تۆ منی حەساندۆتەوە، هەرکەسێك دێتەلامو داوای پارەم لێ دەکات هیچ وەڵامی نادەمەوە، تەنها کتابەکەی تۆی بۆ ڕادەگرمو دەڵێمئەمە بخوێنەوە (مەبەستی ناونیشانی کتابەکە بوو کە بە گەورەیی نووسرابوو تڕحێو).

مامۆستا فەلەك ڕووی لە شاکر ڕۆژبەیانی کردو بە پێکەنینەوە ووتی تۆش زۆر ئاگات لە نووسینەکانی کاك کەمال بێت. کاك شاکریش مقەسێکی لەبەردەم دابوو بەرزی کردەوەو ووتی ئەدی ئەو مقەسەم بۆچیە، ئەو شوێنەی عەقڵم نەیگرێ بەو مقەسە دەیبڕم. مامۆستا فلك الدین کاکەیی بە پێکەنینەوە ووتی نا نا واش ئاسان نیە، کاك کەمال لەسەر پیازیش بنووسێ ئامانجی خۆی دەپێکێ.

لە ڕاستیدا ئەم هەڵسەنگاندنەی مامۆستا فلك الدین بۆ من بڕوانامەیەکی زۆر گەورە بوو هەتا دەمرم شانازی پێوە دەکەم.

## ڕێكخراوی نێودەوڵەتی بۆ فریاكەوتنی كورد

لــە ســاڵی ١٩٩٣ ئێوارەیــەك تــاریق جامبــاز (پــارێزەرو پەرلــەمانتاری پێشووی كوردستان) بە سەردان هاتە بارەگای پارتی پارێزگـای كوردسـتانو بینی لە بارەگا كۆمەڵێك بالە داندراوەو قەمسڵە بەسەر هەژارو كەمدەرامـەتان دابەش دەكرێ. پێی ووتم ئەوە چیە؟ ووتم ساڵانە عومەراغا ئەم كارە دەكـات لەسەر حسێبی خۆی. ووتی بۆ پێی ناڵێیت ڕێكخراوێك دامـەزرێنێت بۆئـەوەی كارەكەی دیارتر بێتو ناویشی بۆ مێژوو دەمینێتەوە. جا ئـەوەبوو ڕۆژێكیـان بیرۆكەكەم هەر بەناوی تـاریق جامبـاز بـە عومـەراغا ووتو ئـەویش پەسـندی كردو داوای لێكردم هەر بەخۆشم پێڕەوێكی ناوخۆی بۆ دابنـێم. جـا ئـەوەبوو ڕۆژێك منی دەعوەتی گوند كرد ووتـی مسـتەر تـۆنیم دەعـوەتكردووە (مسـتر تۆنی كوڕی خوشكی مارگرێت تاتشەر بوو بەرپرسیاری كۆمەكەكانی ئـەورووپا بوو لە كوردستان) تـۆش وەرە لـەوێ باسـی ئـەو ڕێكخراوەشـی بـۆ دەكـەین. ئەوەبوو منو مامۆستا عبدالرحمن كە مودەریسی زمانی ئینگلیزی بوو لەگـەڵ نەجمی كوڕی عومەراغا چوینە گوندو شـەو لـەوێ ماینـەوە. لـە دانیشـتنێكدا بیرۆكەی دامەزراندنی ڕێكخراوەكە بۆ مسـتەر تـۆنی باسـكرا ئـەویش زۆر پێـی باش بوو بەڵام پێشنیاری كرد ووشەی نێو دەوڵەتی بۆ زیاد بكـەین بۆئـەوەی ببێتە ڕێكخراوێكی نێودەوڵەتی تا بتوانێ لەو یارمەتیانـەی كۆمەڵـەی وڵاتـانی ئەورووپی بـۆ كوردسـتانی دەنێـرن بودجەیـەكی بـۆ ببڕێتـەوە. عومـەرئاغا بـە مامۆسـتا عبـدالرحمن ی ووت پێـی بڵـێ زۆر سوپاسـی دەكـەین بـۆ ئـەم یارمەتیدانەی بۆ گـەلی كوردسـتان. مسـتەرتۆنی سـەری خـۆی لەقانـدو ووتـی ببورە من ئەوە بۆ سوپاس ناكەم بەڵكو بەرامبەر پارە دەیكەم، ئەگـەر ئێـوە ڕازیـبن وەكـو ڕێكخـراوی مناڵپـارێزی كوردسـتان كـە هـی هێرۆخانـە مـن نوێنەرێكی خۆم بۆ ئێوەش دیار دەكـەمو بەرلـەوەی پارەكـە بـدەم بـە ئێـوە بەشـی خـۆمی لێ وەردەگـرم. جـا بـەم شـێوەیە لەڕێكـەوتی ١٩٩٣/١١/١٢

ڕێکخراوەکە دامەزراو لە نووسراوێکدا کە ئیمزای بەڕێزان د.خورشید شەوکەت ڕواندزی، ورحمن ابراهیم،و کمال سعدی، وگەلاوێژ عبـدالقادر، ود.فریـا حسـن سعید، ود.دارا عمر میران، وداود یعقوب بەسەرەوە بوو ڕاگەیاندنی بۆ کرا.

شـایەنی ئاماژەبۆکردنـە، مـن کـە یـەکێك بـووم لـە دامەزرێنـەرانی ئـەو ڕێکخـراوە خێرخوازییـە، هـەر ئەوەنـدە ئاگـام لـەو ڕێکخـراوە بـوو تـا لەسـەر بەیاننامەی دامەزراندنەکەی واژۆم کرد، لەوە بە دواوە لە دوورو لە نزیـك هـیچ ئاگاداری نەبووم، پێشم وانیە هیچ یارمەتییێکیان پێشکەش خەڵکی کوردستان کردبێت.

## دیدارەکانم لەگەڵ مام جلال ( ۱۹۹۳و ۱۹۹۵ )

### یەکەم: دیداری ساڵی ۱۹۹۳

لـه سـەرەتای سـاڵی ۱۹۹۳ کاتێـك پـارێزەربووم لـه ژووری پـارێزەرانی کوردسـتان، کۆمـەڵێك مافنـاس لـه نێوانیانـدا بەنـدەو ژمارەیـەك دادوەرو پـارێزەرو داواکـاری گشـتی شـاری هـەولێر لەسـەر دەعـوەتی مەکتـەبی سکرتاریەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئامادەی دیدارێك بووین لەگەڵ بەڕێز مام جەلال تاڵەبانی لە هۆڵی مەکتەبی سیاسی یەکێتی لـه سـەر ڕێگـای عـەنکاوە بـۆ گوێبیسـتبوونی وتـارێکی مـام جـەلال لـەبارەی سـەروەری‌و سـەقامگیری یاسـا لـە کوردسـتان. دوای تـەواوبوونی ووتارەکـە داوا لـە ئامادەبووان کرا ئەوەی پرسیار یان ڕاوبۆچونی هەیە لەسەر ووتارەکە بچێتە لای مایکەکـە بـۆ قسـەکردن. سـەرەتا پـارێزەر مسـتەفا عەسـکەری هەسـتاو کۆمەڵێك ڕەخنەی توندی ئاراستەی بەڕێزییان کرد. مام جەلال بەپێکەنینەوە پێی ووت بیّ قەزابی خۆ تۆ برادەری دێرینمی دە بوو بێیتەلام‌و چایەکیشـمان بەیەکەوە دەخواردەوەو دوو قسەشمان دەکرد. مستەفا عەسکەریش وەڵامـی دایەوەو ووتی جا مام جەلال کێ تۆ دەبینێ تـا مـن بتبیـنم لێرەنـەبێ. دواتـر منـیش چـومە لای مایکەکـەو بەتونـدی ڕەخنـەم لـە ڕەوشـی یاسـاو سەروەرییەکەی گرت لە هەرێمی کوردستان‌و لە میـانی قسـەکانمدا ووتم لێـرە هەموو شتێك بە حزبی کراوەو هیچ بوارێك بۆ کەسـانی بێلایـەن نەماوەتـەوە، تەنانەت هەر لە فەڕاشەوە تـا گـەورەترین پلـەی وەزیفـی نـادرێ بـە کەسـێك ئەگەر سەر بە یەکێك لە دوو حزبەکەی دەسـەڵات نـەبێت. هـەروەها ووتم کـوا سەروەری یاسا لە کاتێکدا من لەناو دادگای هەولێر لەلایەن ئەفسەرێکی باڵای پۆلیسـەوە دەمانچـەم لەسـەر دانـراو هەڕەشـەی کوشـتنم لێکـرا، بـۆ ڕاسـتی قسەکەم ئامـاژەم بۆ دادوەر خلیل ئیسماعیل کـردو پـێم ووت ئـەوەتا جـەنابی دادوەری لێکۆڵینەوە خەلیل ئیسماعیل شایەتە کە دوای دەرچوونی فـەرمانی دەسگیرکردنیشی نەگیرا هەر بۆیە پیشەی پارێزەریم بەجێهێشـت‌و ئێسـتا لـە ماستەری یاسا دەخوێنم بۆئەوەی هیچیتر خەم لە چەسپاندنی یاسـا نـەخۆم تەنها وانەی تیۆری بە قوتابیان بڵێمەوە.

**دووەم: دیداری ساڵی ١٩٩٥**

لــە ســاڵی ١٩٩٥ بــە بۆنــەی جەژنــەوە شــاندێکی پــارتی پارێزگــارانی کوردستان کە پێکهاتبوو لە نەجم عومەر سورچی‌و نـەجات سورچـی‌و عەقیـد محی الدین یـونس ناسـراو بـە ئـەبوو دیـارو نـوری ڕەجـەب‌و جەلالـە فەنـدی‌و بەندە، سەردانی بەڕێز مام جەلال تاڵەبانیمان کرد لە نووسینگەکەی خۆی لـە مەکتەبی سکرتاریەت لە سەر ڕێگای هاوینەهەواری پیرمام.هەر لە میـانی ئـەو دانیشتنەماندا هەنـدێ بیروڕامـان لـەبارەی هەنـدێ بابـەتی سیاسـی گۆڕیـەوە لەوانە من بە مام جەلالم ووت ڕاستە دەڵێن ئێوە ڕۆڵێکی باشـتان هـەبووە لـە نزیککردنەوەی عبدالله ئۆجەلان‌و تورکۆت ئـۆزال سـەرۆکی پێشـووی تورکیـا؟ هەروەها ئەو دەنگۆیانە تا چەند ڕاسـتن کـە دەڵـێن هـەر بەوهۆیەشـەوە باڵـە توندڕۆکانی تورکیـا مەبەسـتم کەمالییەکانـە کـە تورکـۆت ئۆزالیـان ژەهـراوی کردبێت؟ لە وەڵامدا ووتی بەڵێ ئەوانـە هـەمووی ڕاسـتن مـن ویسـتم کێشـەی کورد لە تورکیا چارەسەربکەم عبدالله ئۆجەلان‌و تورکۆت ئـۆزال ئـەوەیان زۆر پێ خۆش بوو بەڵام خوا کەمالیەکان‌و جەنەراڵەکانی سوپا بگرێت کە ئۆزالیان کوشـتو هەڵوێسـتێکی خراپیشـیان بـۆ مـن هـەبوو نەیانهێشـت ئـەم هـەوڵ‌و تەقەلایە سەربگرێت.

دواتـر پرسـیارێکی تـرم لێـی کـرد ووتم مـام جـەلال ئـەوە دەبیـنین لـە کوردستان ئێوەو پارتی شەڕتانە لەسەر دەسەڵات ، ئایا باشـتر نیـە هـەرێمی کوردستان دابەشبکرێت بۆ چەند هەرێمێکی فیدرالی بەمەش هەر هـەرێمێك لـە چوارچـێوەی دەســەڵاتی خۆیــدا خزمــەتی هاوڵاتیــەکانی خــۆی دەکــات‌و شەڕوململانێش ڕوونادات؟ فایلێکی بـەرزکردەوەو ئامـاژەی بـۆ دکتـۆر فوئـاد مەعسوم کردو ووتی ئەوەتا دکتۆر فوئاد دەزانی ئێمـە لـە مەکتـەبی سیاسـی یەکێتی نیشتمانی کوردستان پرۆژەیەکمان لەم بارەیەوە هەیەو پێمـان باشـە هەر شارێکی کوردستان بۆخۆی هـەرێمێك بێـت لـە چوارچـێوەی سیسـتمێکی فیدرالی.

## سێ قوتابی کورد ڕێگا لە سەدام حسێن دەگرن و لێی ئەدەن

لە ساڵی ١٩٩٣ پارێزەر بەشیر حسین ناسراو بە بەشیر کوردستانی کە دواتر بووە داواکاری گشتی لە دادگای هەولێر، بۆی گێڕامەوە ووتی کاتێك کە سەدام حوسێن لە عبدالکریم قاسم دەداتو دەچێتە ولاتی میسر لەوێ کۆلێژی یاسا دەخوێنێ هەر لەو زانکۆیە لەگەڵ دکتۆر فوئاد مەعسومو دکتۆر محەمەد رەمەزانو دکتۆر نایف سلیمان یەکتر دەناسن، ڕۆژێکیان لەسەر تەعلیق لێدان بەخراپی لەسەر کورد، هەرسێکیان ڕێ لە سەدام دەگرنو تەشقەڵەی پێ دەکەن.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، وا ڕێکەوت لە ساڵی ١٩٩٦ دوای تەواوکردنی خوێندنی ماستەر لە یاسا وازم لە پیشەی پارێزەری هێناو لە کۆلێژی یاسا دامەزرامو دکتۆر نایفیش دوای چەند ساڵێك لە کۆلێژەکەمان دامەزرا. زۆرم حەزلێ بوو ئەو ڕووداوە پشتڕاست بکەمەوە بۆیە پێم ووت دکتۆر مامۆستا بەشیر کوردستانی ڕووداوێکی وای بۆ گێڕاومەتەوە ئایا ئەوە ڕاستە؟ ئەگەر وایە دەتوانی تەواوی ڕووداوەکەم بۆ بگێڕیتەوە؟ بە پێکەنینەوە ووتی بەڵێ ڕاست دەکات، ئەو کاتە ئێمە ئەو سێ کەسە بۆ خوێندن چووبووینە ولاتی میسرو لە بەشی ناوخۆیی لە بالأخانەیەك نیشتەجێ بووین پێی دەوترا رەواق الاكراد، سەدام حوسێنیش ئەوکاتە دوای ڕاکردنی لە عێراق هاتبووە میسرو لە کۆلێژی ماف دەیخوێندو لە بالأخانەیەکی دراوسێی ئێمە نیشتەجێ بوو کە پێیان دەووت رەواق العرب. جا زۆرجاران لە یانەی کۆلێژ بەیەکەوە دادەنیشتینو نانمان دەخواردو بە سوعبەتو نوکتە کاتمان بەڕێ دەکرد. جارێکیان بە قسەیەك ئێمەی زۆر توڕەکرد، ووتی من ڕقم لە سێ شت دەبێتەوە، کوردو جورجو کلۆ. ئەوەبوو ئێمەش دوای ئەوە بڕیارماندا پلانێکی بۆ دابنێینو تەشقەڵەی پێ بکەین، بەپێی ئەو پلانە، ڕۆژێك متابەعەمانکرد تا لە شوققەکەی دەرهاتو بەرەو کۆلێژ بەڕێکەوت، ئەوسا بەپێی ئەو پلانەی کە دامانناوبوو، ووردە وردە بەدوایەوە ڕۆیشتین تا بەتەواوی لە بالأخانەکەی دوورکەوتەوە، ئەوسا من لێی نزیك بوومەوەو

شانێکم لـه شـانیدا، ئـاوڕێکی لێ دامـەوەو هـیچ دەنگـی نـەکرد، وای زانـی بـە سوتفە شانم بە شانی کەوتووە، بەڵام جاری دووەم کە شـانم لـە شـانی داوە، پشتی ملی گرتمو بە لێوی شۆستەکەی دادام. دوایـی دکتـۆر فوئـاد مەعسـوم لێی نزیك بۆوەو یەك زەربەی عەکسی لە پشتی ملی داو چەماندیەوە، ئەوکات دکتۆر محەمەد ڕەمەزانیش هاتە لایانو هاوکاری فوئاد مەعسومی کرد، بـەڵام لەبەرئەوەی سەدام حوسێن ڕۆژانە وەرزشـی دەکـرد، دەسـتو بـازووێکی زۆر بەهێزی هەبوو، بۆیە هەرچەندی کردیان پێیان لە عەردی نەدرا. بەم شـێوەیە وازمان لێی هێناو ئەویش بەرەو کۆلێژ بەرێکـەوت. سـاڵ هـاتو ڕۆیشـت، مـن پەیوەندیم بە شۆڕشەوە کردو سەدام حوسێنیش لەو ماوەیـەدا گەڕایـەوە بـۆ عێراقو منیش دوای ڕێککەوتنی جەزائیروهەرەسهێنانی شۆڕش لەگـەڵ شـیخ عوسمـان بـارزانی گەڕامـەوە عێـراقو لـە زانکـۆی موسـڵ دامـەزرام. جـا لـە هـەمووی خۆشـتر، لـە سـاڵی ١٩٧٩ سـەدام حوسـێن بـووە سـەرۆك کۆمـاری عێراقو بە مەرسومێکی کۆماری دکتۆر محەمەد ڕەمـەزانی لـە پۆسـتی ڕاگـری کۆلێژی شەریعە لە زانکۆی بەغدا دامەزرانـد. مـن کـە ئـەم هەواڵـەم زانـی زۆر سەرم سوڕما، لە دڵی خۆم ووتم تۆ بڵێی ئەو ئێمەی لەبیر چوبێت کە لە میسر شەڕمان لەگەڵی کرد. بۆیە چـوومە بەغـداو سـەردانیم کـرد، ووتم محەمـەد بـە درێژایی ئەو ماوەیە من لە ترسی سـەدام حوسـێن ئـۆقرەم نـەبووە، تـۆ بڵێـی ئەو ڕۆژەی لەبیرچوبێتەوە، چۆن بـوو تـۆی لـەم پۆسـتە گرینگـە دامەزرانـد؟ ووتی ڕاستییەکەی منیش وەکو تـۆ هـەر دەترسـام بۆیـە داوای دیـداری ئـەوم کردو توانیم بگەمەلای‌و داوای لێبووردنم لێی کرد بۆ ئەوەی کـە لـە ڕابـردوودا ڕوویـداوە. بـەڵام ئـەو زۆر ڕێـزی لێگـرتمو ووتـی پێویسـت بـە داوای لێبـوردن ناکات، تۆو فوئاد مەعسوم ئازابوون، بەڵام برادەرەکەی ترتـان مەبەسـتی تـۆ بوو ترسنۆك بوو. بەم شـێوەیە ڕووی تێکـردمو ووتـی چـیت تـەواو کـردووە؟ ووتم کۆلێژی شەریعە، ووتی باشە لە پۆسـتی ڕاگـری شـەریعە داتدەمـەزرێنم. بەم شێوەیە منی لەو پۆستە دامەزراندو لەو ساتەشەوە تا ئێستا ئـەو تـرس‌و لەرزەی لە دڵم دابوو نەماو حەسامەوە.

## سەدام حسێن لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەمریکا زۆر بێباك بوو

ئەندازیاری سەرباز (ف.س) بۆی گێڕامەوە ووتی بە حوکمی ئـەوەی مـن نەخشەسازی خانووەکەی قائیـدی فەیلـەقی پاسـەوانی گـاردی کۆمـاری لیـوا ئیبراهیم عبدالستار التکریتی ئامۆزای سەدام حوسێن بـووم، بۆیـە لـە جیـاتی سەربازگە، لە ناوکێڵگەکشـتوکاڵیەکەی لـە ناوچـەی تارمیـە لـە شـاری بەغـدا لەسـەر پـڕۆژەی خانووەکـەی دەوامـم دەکـرد. دیوەخـانێکی دوانـزە مـەتر چوارگۆشەییم لەسەر داوای خۆی لەنەخشەی خانووەکەی دروستکردبوو، ئەم داوایەی خستبووە بەردەم دەزگای ئەندازەی سەربازی بـۆ جێبـەجێ کردنـی، بەڵام لەمن بەو لاوە کەس نەیتوانی نەخشەی بۆ بکێشـێ لـە ترسـی سـزادان، چونکە قائید فەیلەق هەڕەشەی کردبـوو ووتبـووی ئەگـەر ئـەو خـانووەی کـە دەکرێ هەر کێشەیەکی هونەری هـەبێت لـە ئێسـتاو لـە دوا ڕۆژدا ئـەوا دەبـێ ئەندازیارەکەی هەموو بەرپرسیارێتییەکی بگرێتە ئەستۆی خۆی. جا ئەوەبوو تا ئەو خانووە تەواو بوو دڵـم  دەترسـا نـەك نەخشـەو پلانەکـەم سـەرکەوتوو نەبێت.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، ئەندازیاری ناوبراو لە درێژەی قسـەکانیدا ووتـی دوای ئەوەی خانووەکـە تـەواو بـوو بـێ ئـەوەی هـیچ دەرزێـك یـان عـەیبێکی هەبێت، تەنها ئەوەندە مابوو وەریبگرێتو بچێتە ناوی. ئێوارەیەك قائید هاتە سەر خانووەکەیو زۆر دودڵ بوو، هیچ ئۆقرەی نـەبوو، کورسـیێکیان بۆدانـاو لەبەردەم خانووەکە دانیشت. جگارە لە دوای جگارەی دەکێشا، قەت وەهـام بە دوودڵی نەبینی بوو، دڵم ترسا، لە دڵی خۆمدا دەمووت تـۆ بڵێـی عـەیبێکی لە خانووەکە نەبینیبێتەوە ! دوای تۆزێـك بـانگی کـردمو ووتـی دانیشـە، ووتم چۆن دەبێ، من بەپێوە دەوەستم. ووتی دانیشە، شتێکت بۆ دەگێڕمەوە مـن هیچی تێناگەم بزانم تۆ چی لێ تێدەگەیت. جـا ئـەوەبوو ڕووی لـە مـن کـردوو ووتـی دەزانی من ئێستا لە کـوێ دێمـەوە؟ ووتم لـە بـەرەکانی جـەنگ؟ ووتـی

نەخێر لە کۆشکی کۆماری لەلای سەید ئەلرەئیس (مەبەستی سەدام حوسێن بوو). لە درێژەی قسەکانیدا ووتی کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرۆکی ئەرکانی سوپاو گشت قائید فەیلەقەکانو سەرکردە بالاَکانی سوپا کرد، ئێمە چاوەڕێی بیروراگۆڕینەوە بووین بۆ چۆنێتی ڕووبەڕوو بوونەوەی هێزەکانی ئەمریکا ئەگەر هەر هێرشێك بکەنە سەر عێراق، بەلاَم پێچەوانەی پێشبینی ئێمە، سەید ئەلرەئیس دەسپێکی کۆبوونەوەکەی بە گێڕانەوەی نوکتەیەك دەستپێکردو ووتی ئێوەش بە نۆرە هەریەکەو نوکتەیەك بگێڕێتەوە. بەم شێوەیە زۆریمان لەخۆمان کردو دەستمان کرد بە نوکتە گێڕانەوە تا نیوەڕۆ داهات، ئەوسا ڕووی تێکردینو ووتی دەزانم برسیتانە بەلاَم من حسابی ئەوەم بۆتان کردووە، ئەمڕۆ هەمووتان دەعوەتی مننو بەیەکەوە نان دەخۆین، دەشزانم دەمێکە نەچوونەتەوە بۆ ناو ماڵو منداڵتان، بۆیە هەریەکێکتان سێ ڕۆژ ئیجازەتان پێدەدەم دوای نانخواردن بڕۆنەوە ناو خێزانی خۆتانو ئەو چەند ڕۆژەیان بە خۆشی لەگەڵ بەسەرببەنو هیچ بیر لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەمریکا مەکەنەوە، ئەوە بۆمن لێبگەڕێن خۆم پلانی بۆ دادەنێم.دوای ئەوەی قائید فەیلەق ئەنجامی کۆبوونەوەکەی خۆی لەگەڵ سەدام حوسێن بۆ گێڕامەوە ووتی ئێستا پێم بڵێ تۆ چی لێ تێگەیشتی؟! منیش ووتم گەورەم من لەوەترسام عەیبێکت لە خانووە بینیبێتەوە، من هیچ سەرم لەوە دەرناچێت.

## ئەزموونی ڕاگرایەتیم :

**یەکەم: ئەزموونی ڕاگرایەتیم لە کۆلێژی یاسا**

لە ٢٠٠٥/٥/٤ تاکو ٢٠٠٧/٥/٢٥سەرۆکی بەشی یاسا (بەیانیانو ئێواران) بووم لە کۆلێژی یاسا زانکۆی سەلاحەدین. کاتێك دکتۆر محەمەد شەریف ڕاگری کۆلێژەکەمان دەستی لە کارهەڵگرت بۆئەوەی لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق وەك پەرلەمانتار دەسبەکاربێت، ئەوەبوو لە ٢٠٠٦/٢/١٢ وەکالەتی ڕاگرایەتی کۆلێژی پێدامو ووتی من کارم لێرە تەواو بوو بۆیە وەکالەتی ڕاگرایەتیت دەدەمێو تۆش بۆخۆت هەوڵ بدە بە ئەساڵەت لەو پۆستە جێگیرت بکەن چونکە ئەوە بە دەست من نیە دەنا هەر ئێستا فەرمانم بۆ دەردەهێنایت.

بەهەرحاڵ ماوەی چەند مانگێك بوو وەك ڕاگری کۆلێژ بە وەکالەت کارم دەکرد، ئەوەبوو هاوسەرەکەم تووشی نەخۆشی شێرپەنجەبوو بۆیە پزیشکەکانی ڕاپانسپارد کە بۆ چارەسەر ببیەین بۆ وڵاتی ئێران، بۆیە ناچاربووم لەو گەشتەیدا خۆم یاوەری بکەم، جا ئەوەبوو دوای پەیوەندیکردن بە سەرۆکی زانکۆ، ووتی کەسێك بدۆزەوە تا لە شوێنەکەت کاربکات بە وەکالەت تا لەو گەشتەت دەگەڕێیتەوە. جا بۆ ئەم مەبەستە پەیوەندیم بە دکتۆر (ج.س) کردو تەنانەت زۆریش تکام لێی کرد تا ڕازی بوو لەو ماوە لەجیاتی من دەوام بکات، بەڵام ئەوەی سەیرو سەمەرە بوو، دوای گەڕانەوەم ڕووبەڕووی موفاجەئەبووم کاتێك بینیم مامۆستای ناوبراو کودەتایەکی سپی لەسەرم کردووەو خۆی لە شوێنی من چەسپاندووە.

لە ڕاستیدا ئەم پۆستە بۆمن شتێکی زۆر گرینگ نەبوو تا چاوم لێی بێت، بەڵام لەبەرئەوەی بە فڕوفێڵ هاتە شوێنەکەم بۆیە بە پێویستم زانی بچمە لای سەرۆکی زانکۆ (دکتۆر م.ص) بۆ ڕونکردنەوەی ئەم گۆڕانکاریە. ئەوەبوو چوومە لایو پێم ووت ئەی تۆ نەتووت کەسێك لە شوێنی خۆت دابنێ، ئەی خێرە تا هاتمەوە منت بەیەکجاری لاداو ئەوت لە شوێنی من

جێگیرکرد؟ ووتی مامۆستا فلان هاتە لام‌و ووتی من مامۆستای ئەو بوومە چۆن دەبێ من بە وەکالەت لەشوێنی ئەو کاربکەم‌و دواتر بگەڕێمەوە شوێنی خۆم، بۆیە داوای کرد لە شوێنی تۆ جێگیری بکەم، منیش زۆر ئیحراج بووم چونکە پیاوێکی بەتەمەنە بۆیە لە شەرمان بە قسەیم کرد.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، دوای تێپەڕبوونی ماوەی زیاتر لە ساڵێك مامۆستای ناوبراو تەمەنی گەیشتە خانەنشینی بەلاّم مەعامەلەی خانەنشینی خۆی بۆ زانکۆ بەرزنەکردەوە لە کاتێکدا مامۆستایەکی تری بەتەمەن لەخۆی بچوکتری خانە نشینکرد، ئەمەشلە ڕۆژنامەکانی ئەوکات بە تایبەتی ڕۆژنامەی هاولاّتی دەنگی دایەوە، دواتر نووسراوێك لە زانکۆ هاتبوو بۆ ئیفادبوونی دوو مامۆستای پسپۆرو ئینگلیزیزان بۆ خولێکی فێرکردن بۆ ماوەی سێ مانگ لە بەریتانیا، مامۆستای ناوبراو بەبێ ئەوەی پسپۆربێت‌و ئینگلیزیزانیش بێت ناوی خۆی‌و مامۆستایەکی تری داناو دوای ماوەیەك بە فەرمانی وەزارەتی خوێندنی باڵاّو توێژینەوەی زانستی گەشتی کرد بۆ بەریتانیا. جا دوای ئەوەی پۆستی ڕاگری کۆلێژ بە بەتاڵی مایەوە جارێکی تر سەرۆکی زانکۆ بە تەلەفۆن پەیوەندی پێوەکردمەوەو ووتی فەرمانی تۆم دەرهێناوە بۆ بەڕێوەبردنی کۆلێژ بەوەکالەت، جا چی دەڵێی خۆم بێمەلات‌و بۆت بێنم یانیش بەدەستی بەڕێوەبەری نووسینگەکەم بۆت بنێرم؟ منیش ووتم داوای لێبووردن دەکەم، من تاکو ئێستا کودەتایەکەی پێشترم لەبیرنەچۆتەوەو حەزیش ناکەم جارێکی تر ڕووبەڕووی شتی وا ببمەوە، بۆیە تکایە کەسێکی تر لە شوێنی ئەو دابنێ. ئەوەبوو سەرۆکی زانکۆ جارێکی تر پاکانەی بۆ ڕووداوەکەی جاری پێشوو هێنایەوەو ووتی مامۆستا (ج.س) تەمەنی بەسەرچووەو ناچارین خانەنشینی بکەین، بۆیە دڵنیابە جارێکی تر ڕووداوی پێشوو دووبارە نابێتەوە.

ئیتر بەم شێوەیە بۆ جاری دووەم بوومەوە ڕاگری کۆلێژ بەوەکالەت‌و لەو پۆستە مامەوە بۆ ماوەی زیاتر لە ساڵ‌و نیوێك، تەنانەت کاتێك بە فەرمانی وەزارەتی خوێندنی باڵاّو توێژینەوەی زانستی کۆلێژی زانستە

سیاسیەکان هەڵوەشایەوەو لەگەڵ کۆلێژی یاسا تێکەڵ کرایەوە دوای تێکەڵ بوونەوەیان ئەرکی ڕاگرایەتی ئەو کۆلێژە نوێیە یان بەمن سپاردو لە ٢٠٠٦/٧/٢٨ تاکو ٢٠٠٨/٥/١٥ وەکو ڕاگر تیایدا مامەوە تا دواتر فەرمانم بۆ دەرچوو بە ئەساڵەت بوومە ڕاگری کۆلێژی پەروەردەی مرۆڤایەتی.

لەماوەی کارکردنم وەکو ڕاگر لەو کۆلێژەدا کۆمەڵێك کەسایەتی سیاسیو کۆمەلأتی بەناوبانگم لە نزیکەوە ناسی، لەوانە عەلی قازی (کوڕی پێشەوا قازی محەمەد) لە ساڵی ٢٠٠٧ بە یاوەری پارێزەر عومەر حەمە عەلی سەردانی کۆلێژەکەمانی کردو دواتریش کۆڕێکمان لە هۆڵی سیمیناراتی کۆلێژ لەسەر ڕەوشی سیاسی ڕۆژهەلأتی کوردستان بۆ گێڕا. هەروەها هەر لەو ماوەیەدا دادوەر محەمەد عرێبیم ناسی کە دادوەری کەیسی ئەنفال بوو لە دادگای بالأی تاوانەکانی عێراقی، دواتریش جەعفەر موسەویم ناسی کە داواکاری گشتی بوو لە کەیسی دادگاییکردنی سەدام حسێنو یادەوەرییێکی خۆی بۆ گێڕامەوە لەگەڵ سەرۆکی پێشووی عێراق لەزیندانی ئەمریکیەکاندا، ووتی جارێکیان سەردانی سەدام حوسینم کرد لە زینداندا، شوێنی زیندانیکردنەکەی بریتی بوو لە ژوورێكو هەیوانێكو باخچەیەکی بچووك کە هەندێ گوڵو سەوزەی لێ چاندبوو. لە درێژەی قسەکانیدا ووتی بەیەکەوە لەسەر دوو کورسی لەناو باخچەکەی دانیشتین، جگارەی چرووتی کوبی دەرهێنا، جگارەیەکی بۆخۆی داگیرساندو دانەیەکیشی بۆ من ڕاگرت، منیش لێم وەرگرتوخستمە ناوگیرفانم. ووتی باجگەرەیەکی تریشت بدەمێ، ووتم سوپاس نامەوێ بیکێشم تەنها بۆ یادگاری لای خۆم هەڵی دەگرم. منیش لێم پرسی وورەی چۆن بوو؟ لەوەلأمدا ووتی وورەی زۆر بەرز بوو، هەستت نەدەکرد کە لە زینداندایە، هەندێ کتابی لابوو دەیخوێندنەوەو یادەوەرییەکانی خۆشی دەنووسیەوە، ئەمانەم هەمووی لەلا بینی. هەر لە میانی قسەکانیدا ووتی چەند جارێکی تریش لە دەرەوەی زیندان بەر لە چوونە ناوهۆڵی دادگا بینیمەوە، ئەو هیچ کاتێك بۆخۆی داوای یارمەتیو

بەزەیی لە ئێمە نەدەکرد، بەڵام هەموو جارێك داوای لێ دەکردم کە ئاگامان لە بارزان ئیبراهیمی زڕبراکەی بێت، دەیووت نەخۆشی شێرپەنجەی هەیە ئاگاتان لێی بێت. هەروەها بۆی گێڕامەوە ووتی بەر لە لەسێدارەدانی جارێکی تر لە زیندان بە یاوەری ئەمریکیەکان چومەلای بۆ گواستنەوەی لەو زیندانە بۆ زیندانی عێراقیەکان، ئەو ڕۆژە لە هاتنە دەرەوەو بەدەم ڕێگاوە بە زمانی ئینگلیزی لەگەڵ ئەو سەربازە ئەمریکیە قسەی کرد کە یاوەری بوو بۆ گواستنەوەی بۆ زیندانی عێراقیەکانو پێی ووت دەمەوێ بەرپرسە گەورەکەتان ببینمو قسەیەکی لەگەڵ بکەم. لەوەڵامیدا سەربازە ئەمریکییەکە ووتی لە ئێستاوە تا لە سێدارە دەدرێیت هیچ بەرپرسێکی ئەمریکی لەمن گەورەتر نابینیت. بەمەش سەدام حوسێن بێ ئومێد بوو بەڵام سەرەڕای ئەوەش وورەی بەرنەداو کۆنترۆلی خۆی لە دەست نەدا.

**دووەم: ئەزموونی ڕاگرایەتیم لە کۆلێژی پەروەردەی مرۆڤایەتی**

لە شەوی ٢٠٠٨/٢/١٠منو چەند مامۆستایەك لە مەڵبەندی ڕۆشنبیری پزیشکان لە شەقامی سی مەتری دەعوەت بووین، کاتژمێر دەو پانزە دەقیقە زەنگی موبایلەکەم لێیدا، کاتێك هەڵمگرت (ح.د) کە لە نووسینگەی سەرۆك کاری دەکرد، پیرۆزبایی لێکردمو ووتی تۆ بووی بە ڕاگری کۆلێژی پەروەردەی مرۆڤایەتی.بۆمن ئەم هەواڵە موفاجەئەبوو، چونکە دوای کۆتاییهاتنی ئەرکی ڕاگرایەتیەکەم لە کۆلێژی یاساو ڕامیاری، خۆم ئامادە کردبوو کە وەك مامۆستا دەستبەکار ببمەوەو هیچ بەڵێنێك یان ئاماژەیەکیشم بۆ نەکرابوو کە ببمەوە ڕاگر لە شوێنێکی تر. تەنانەت بەرپرسێکی باڵا پێشتر بە ئامادەبوونی دکتۆر (ك.أ) سێ بژاردەی خستەبەر دەستم کە یەکێکیان هەڵبژێرم. بژاردەکان بریتی بوون لە دەستبەرداربوونم لە پۆستی ڕاگری کۆلێژی یاساو ڕامیاری بەرامبەر پۆستی ڕاگری کاروباری قوتابیان یان ڕاگری خوێندنی باڵا یان یاریدەدەری سەرۆکی زانکۆ بۆ

کاروبـــاری زانســـتی.، بـــەلاّم هـــەر هـــەموویانم ڕەتکـــردەوەو ووتم بـــۆمن مامۆستایەتی لە کۆلێـژی یاسـاو ڕامیـاری هـیچ جیـاوازییێکی نیـە لەگـەڵ ئـەو پۆستانە. جا بۆیە بە حەقیقەت نە پێشتر ئاگام لەم هەواڵە بـوو بووەنـە لـە خەیاڵیشمدا بوو.

بەهـــەرحاڵ، دوای دەســـبەکاربوونملە ٢٠٠٨/٢/١٥ تـــا ٢٠١٠/٨/١٠ بـــە ئەساڵەت ئەرکی ڕاگرایەتی ئەو کۆلێژەم پێ سـپێردرا، لـەو ماوەیـەدا هەسـتم کرد، مافی مرۆڤ وەکو پێویست لە هـەرێمی کوردسـتان بایـەخی پـێ نـەدراوە بۆیە بەباشم زانی بەشـێکی زانسـتی لـەو کۆلێـژە بـەناوی پـەروەردەی مـافی مرۆڤ بکەمەوە بۆ پێگەیاندنی مامۆستای پسـپۆر لـەم بـوارەدا بـۆ ووتنـەوەی وانەی مافی مرۆڤ کە لەو دەمەدا وەکو پێویسـت نـەبوو بـە هـۆی ناشـارەزایی ئەو مامۆستایانەی ئەو وانانە دەڵێنەوە، لە کاتێکدا کە لە هەشت پۆل هەر لـە سـەرەتایی تـا دەگاتـە ئامـادەیی ئـەم وانەیـە دەخوێنـدرا. بەهـەرحاڵ، دوای هەوڵو تەقەلاّیەکی زۆر بـە ڕەزامەنـدی ئەنجومـەنی زانکـۆ تـوانیم ئـەم بەشـە بکەمەوەو مامۆستاو کتێبخانەو گشت پێداویستیەکانی تـرم بـۆی ئامـادەکردو لـە سـاڵی ٢٠٠٩ پـەنجا قوتابیمـان لـە پلانـی وەرگرتنـی قوتابیـان بۆسـاڵی خوێنـــدنی ٢٠٠٩/٢٠١٠ دانا.بـــەلاّم بەداخـــەوە وێـــڕای ڕەزامەنـــدی پێشـــتری وەزارەتی پەروەردەو وەزارەتی خوێندنی بالاّ لەسەر کردنەوەی کەچی لێمـان هەڵگەڕانـەوەو لـە بڕیارەکـەی خۆیـان پاشـگەزبوونەوەو هـیچ ژمارەیـەکی قوتابیان بۆ نەخستینە ناو پلانی وەرگرتنی قوتابیانەوەو بەمەش بەشەکە بـۆ مـــاوەی دوو ســـاڵی خوێنـــدن هـــەر بـــەناو مایـــەوە تـــا دواتـــر پـــاش دەسـتلەکارهەڵگرتنم لـەو کۆلێـژەو گەڕانـەوەم بـۆ کۆلێـژی یاسـاو ڕامیـاری، بەیـەکجاری هەڵوەشـایەوەو مامۆستاکانیشـی بـۆ شـوێنی تـر گوێزرانـەوە. هەروەها یەکێکی تر لەو دەسکەوتانەی کە شانازیم پێیەوە دەکرد کردنەوەی یەکەیەکی توێژینەوەی زانسـتی بـوو لـەو کۆلێـژە، کەچـی ئـەویش هـەر دوای ڕۆیشتنی من لەو کۆلێژە هەڵوەشێندرایەوە.

## دیدارم لەگەڵ حوسێن ئاغای سورچی

لــە ســاڵی ١٩٩٣ ئێمــە کۆمــەڵێك کــەس لەســەر دەعــوەتی عومــەرئاغای سورچی چـوینە گونـدی کەڵـەکینی سەرچـیا، هونەرمەنـدی شـانۆکار سـەباح عبدالرحمنو سەعدون یونس لە نێوانیاندا بوون. ئەو دوو بەڕێزە بە پەیوەندی خزمایـەتی خـاڵو خوارزایـەتی مـنو حوسـێن ئاغایـان دەزانـی بۆیـە داوایـان لێکردم لەگەڵیان بچمە دیوەخانی حوسێن ئاغا، جا ئـەوەبوو چـوینە ماڵیـانو لە ژێر کەپرەکەیان لە گەڵی دانیشتین. ئەو دوو بەڕێزە ڕوویان لە حسێن ئاغا کـردو ووتیـان ئاغـا وەکـودەزانین ئێـوە بـەر لـە ڕاپـەڕین موستەشـار بـونو پەیوەندیشــتان لەگــەڵ حکومــەت زۆر کۆنــە، چــی وای لێکــردن لێــی هەڵگەڕێنـەوەو بـەرگری لێ نەکـەن؟ لەوەڵامـدا حوسـێن ئاغـا ووتـی زۆر شـت هـەبوون بـەڵام دوو شـتتان بـۆ دەگێڕمـەوە. ووتـی تـازەدەنگۆی تێکچـوونی بارودۆخی سوپاو جموجۆڵی پێشمەرگە لە گۆڕێ بوو، قائیدی فەیلەقی پێـنج کۆبوونەوەیــەکی لەگــەڵ ئێمــەی موستەشــارەکانی کوردســتانکردو داوای لێکردین کە بە هەموو شێوەیەك بەرگری لە کوردستان بکەین. ئێمـەش داوای هاوکاریی سوپامان لێی کرد، لە وەڵامـدا ووتـی سـوپا پەرتـەوازەو لاواز بـووە تەنها بەرگری پێ لەخۆی دەکرێت، بۆیە دەبێ ئێوە بەتەنها پشت بـە خۆتـان ببەستن. هەر لە درێژەی قسەکانیدا ووتی جا کاتێـك کۆبوونەوەکـەمان تـەواو بوو هاتینـە دەرەوە، ئـەنوەر بێتواتـە هاتـە لامو ووتـی حوسـێن ئاغـا چـۆنی تێدەگەی؟ چیبکەین باشە؟ منیش ووتم جا ئێمە چ مەجبورین شەڕی خۆترێن بکەین!! ئێمەش لە قەومی خۆمان جودا نابینەوەو کوڕی خەڵکیش لۆ بەعس بە کوشتن نادەین.

شایەنی باسە، سەبارەت بە ڕووداوی دووەمـیش ووتـی لـە گونـدی لـەبن ئەو کەپرەی دانیشتبووم، لـە معەسـکەری سـپیلکی زابتـەك هاتـە لامو گـۆتی عەلی حەسن مەجید دەیەوێ سەعات چواری ئێواریێ لە سپیلکی قسەت لەگەڵ

بکات. جائـەوەبوو لـەو مەوعیـدی دایـان نـابوو چـومە معەسـکەری سـپیلکی‌و قسەم لەگەڵ عەلی حەسەن مەجید کرد گۆتی یەك ملیـۆن دینـارت لـۆ دەنێـرم بەسەر عەشیرەتی خۆتی دابەش بکە بـا دیفـاع لـە سـپیلك بکـەن‌و تەسـلیمی نەکەن، منیش گۆتم مـن دوو ملیـۆن دینـارت ئـەدەمێ ئـەتوو وەرە دیفـاع لـە سپیلکی بکە. کە ئەوەم گۆت زۆر لێم تورە بوو گۆتی حسێن ئاغـا وات لێهـات بەو شێوازە وەڵامم بدەیتەوە؟

جا هەردوو هونەرمەنـدان بەسـەر سـوڕمانەوە بـە حوسـێن ئاغایـان ووت ئاغا ئەوجا تۆ چیت ووت؟ لەوەڵامیاندا حوسـێن ئاغـا ووتـی منـیش نـەمکردە نامـەردی تەلـەفۆنم بـەدەوی داخسـتەوەو معەسـکەرم بـە تـووڕەیی بـەجێ هێشت.

## بەخشینی پارەو زێڕ

لە کۆتایی سالآنی هەشتاکاندا کاتێك ڕژێمی پێشوو هەڵمەتی بەخشینی پارەو زێڕی گرتە بەر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو کێشە ئابوورییەی بەهۆی جەنگی قادسیەی سەدامەوە دووچاری ببوو. جا بۆ ئەم مەبەستە وێڕای جاڕدانی ئەو هەڵمەتە بەنێو خەڵکدا، لە هەمان کاتیشدا فشاریان دەخستە سەر بازرگانو کۆمپانیاو دەوڵەمەندەکانی عێراق.

ئێوارەیەك سەردانی سابیر ڕەشیدی هاوڕێمم کرد لە دوکانەکەی لە شوێنی چایخانەی عەبۆ، ئەوکاتە پێلآوو نەعلی لاستیکی بە جوملە دەفرۆشت، ڕێکخراوەکانی حزبی بەعس پسوولەیەکیان پێی دابوو کە بڕی دوو هەزار دینار بە ڕژێم ببەخشێت بۆ پشتگیری جەنگی قادسیەی سەدام.جا ئەوەبوو سابیر ڕەشید ووتی کاك کەمال ئەو ئیشەی من لای کەسێکە ناوی سامر نورەدینەو لە فرقەی فاروقە لای ئێوە فەرمانبەرە، دەتوانی لەگەڵم بێیتە لای پێی بڵێی بۆم کەم بکاتەوە چونکە بڕەکەی زۆرە؟ منیش ووتم بەسەرچاو، ئەوەبوو هەر ئەو ئێوارەیە چوینە لایوداوامان لێیکرد کە بۆمان کەم بکاتەوە. ئەویش دوای بەخێرهێنان، ڕێزی لێگرتینو ووتی با هیچ نەدات. سابیر ڕەشید تەماشایەکی کردمو بە سەبری پێی ووتم نەبادا بۆمن خراپ بێتو بڵێن هیچی نەداوە، با هەر هیچ نەبێت شتێکمان لێ وەربگرێت. منیش ئەوەم پێی ووتو ئەویش بڕەکەی بۆ کردین بە پارەیەکی زۆر کەم (لەبیرم نەماوە) ووتی دەزانی بۆ دەڵێم با هیچ نەدات؟ ووتم بۆ؟ ووتی هەمووتان (ج.خ) دەناسن کە دەوڵەمەندترین کەسی شاری هەولێرە، پێمانووت پارە یان زێڕ ببەخشێت، ئەو تەنها دوو هەزاردیناری بەخشی، ئێمەش ئاگاداری سەرکردایەتی حزبی بەعسمان کردەوە، خودی سەدام حسین سەرۆکی حیزب بە نووسراوێك ئاگاداری کردینەوە کە ناوبراو تەنها لە ماوەی ساڵێکدا نزیکەی یەك ملیۆن دیناری لە بازرگانی هەناردەکردنو هاوردندا قازانجکردووە، بۆیە

ئەگەر لە سەد هەزار دینـار کـەمتری دا بیگـرن. ئـەوەبوو ئێمـەش ئاگادارمـان کردەوە، ئەویش ڕازی بوو کە بڕی سەد هەزار دینار بدات. ئێمەش پێمـانووت ئەو بڕە پارەیە بدەیت لـە داهـاتوودا وون دەبێـتو کـەس پێـی نـازانیێ، بۆیـە باشتر وایە قوتابخانەیەك بە بڕی سەدوبیسـت هـەزار دینـار دروسـت بکـەیتو ناویشت بەسەریەوە هـەتا هەتایـە دەمێنێتـەوە. ئـەوەتا لـە شـاری سـلێمانی دەوڵەمەندێك بە ناوی عەلی کەمال لە جیاتی بەخشـینی پـارە قوتابخانەیـەکی دروستکردووە. هەر لە درێژەی قسەکانیدا ووتی دەزانن بە قسـەی نـەکردینو ووتی من تەنها ئەو بڕە پارەیە دەدەم.

## چۆن تەشهیریان پێکردم

لە ساڵی ١٩٩٩بابەتێکم لەگۆڤاری (ڕەنگین) ژمارە (١٢٠) ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٩٩بڵاوکردەوە بە ناو نیشانی (نەفرەت لە ئەمریکا)، ئەوکاتە ماوەیەکی زۆر بەسەر گرتنەوەی شاری هەولێر تێنەپەڕی، بۆیە لە هەندێ بواری جیاجیادا جۆرێك لە پەیوەندی لەنێوان هەندێ لە حیزبو کەسایەتیە سیاسیەکانی هەرێمی کوردستانو ڕژێمی پێشوو دروست ببوو، جا چ ژێربەژێر بێت یان بە ئاشکرا، بە تایبەتی لە بواری وەرزش ئەم پەیوەندییە زۆر بەهێزبوو هەموو کەسێك هەستی پێ دەکرد، بەوەی بەشێك لە تیپە وەرزشیەکانی هەرێم بە تایبەتی لە هەولێرو دهۆك بۆ تۆپانێ دەچوونە شاری بەغداو شارەکانی تری عێراق بۆ بەشداریکردن لەگەڵ تیپەکانی ئەوێ. جا ئەوکاتە من بەهۆی نەخۆشی هاوسەرەکەم کە دووچاری نەخۆشی شێرپەنجە ببوو، ناچاربووم هاتووچۆی شاری موسڵ دواتر بەغدا بکەم چونکە ئەوکاتە لە هەرێمی کوردستان نەخۆشخانەو پزیشکی تایبەت بەو نەخۆشیە نەبوون، جا ئەوەبوو شەوێك لە هۆتێل بووم لە شاری بەغدا، وڵاتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا چەند موشەکێکی تۆماهۆکی لە بەغدا گرت هەندێ شوێنی مەدەنی نشینی کردە ئامانج، بۆیە منیش هەستم جوڵاو ووتەیەکی چەپەکانم بیرکەوتەوە کە دەیانووت ئەمریکا دوژمنی گەلانە، جا ئەوەبوو ووتارێکم بۆ گوزارشتکردن لەو هەستەم بەرامبەر بە ئەمریکا نووسیو لە گۆڤاری ڕەنگین بڵاوکردەوە. بەڵام ئەوەی جێی داخە، دیزاینو شێوازو شوێنی بڵاوبوونەوەی ووتارەکەم، وای کرد دواتر لێکدانەوەی خراپی بۆ بکرێت، تەنانەت هەندێ کەس نەك لێکدانەوەی خراپ بەڵکو بە ئاراستەی تەشهیرکردنیان دژ بە من برد. مەبەستم لە شێوازو شوێنی بڵاوکردنەوەکەی ئەوەیە کە بەڕێوەبەری گۆڤارەکە بە نیازێکی خراپ وتارەکەمی کردبووە وتاری کردنەوەی گۆڤارەکەو وێنەیەکی سەدام حوسێن سەرۆك کۆماری

عێراقیشی لە گەڵ دابەزاندبوو کە هیچ پەیوەندی بە ووتارەکەی منەوە نەبوو.

بەهەرحاڵ، هەرزوو دوای دەرچوونی گۆڤارەکە، هێشتان من نەمبینی بوو، مامۆستا فلك الدين كاكەيى كە ئەوكاتە وەزیری رۆشنبیری هەرێم بوو شاکر رۆژبەیانی کە ئەوکاتە بەرێوەبەری گشتی بوو لە وەزارەت نارده لامو دانەیەك لەگۆڤارەکەی بۆ ناردم ووتی مامۆستا بە بلاوبوونەوەی ئەم بابەتە زۆر نیگەرانە ووتی ئایا هی تۆیە؟ منیش دوای ئەوەی بابەتەکەم خوێندەوە وێرای ئەوەی لەگەڵ دابەزاندنی وێنەی سەرۆك كۆمار نەبووم لەگەڵ ووتارەکەمدا، بەلام هیچ دەسکارییێکی ناوەرۆکەکەیان نەکردبوو، بۆیە ووتم بەڵێ ئەوە هی منەو من خۆم لێی بەرپرسیارمو چونکە بە ویستو ئارەزووی خۆم بۆیانم ناردووە.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، رۆژی دواتر دکتۆر سەعدی بەرزنجی کە ئەوکاتە راگری کۆلێژەکەمان بوو، بەدوایدا ناردمو کۆپییێکی گۆڤارەکەی پیشان دامو ووتی فەرەنسۆ هەریری پارێزگاری هەولێر دەڵێ چۆن لێرەوە نووسین بۆ گۆڤارێك دەنێرێ کە رژێم دەری دەکات.منیش ووتم نازانم جیاوازی چیە لە نێوان ناردنی تیپە وەرزشیەکانی هەرێمی کوردستان بۆ شارەکانی تری عێراق لەگەڵ بلاوکردنەوەی نووسین لە گۆڤارو رۆژنامەکانی ئەوێ.

بەهەرحاڵ، هەروەکو ووتم ئەم بابەتە لەلایەن هەندێ کەسەوە قۆزرایەوە بۆ تانەوتەشەردان لێم کە هەندێکیان مەرامی شاراوەی لە پشتەوە بوو، دواتر بۆم دەرکەوت. سەرەتا لە رۆژنامەی میدیا بە چەند ژمارەیەك زۆر بە خراپی لەسەرم نووسرا هەروەکو ئەوە وابێ من خیانەتم لە میللەتەکەم کردبێتو دەستم لەگەڵ دوژمنی گەلەکەم تێکەڵ کردبێت!! بەلام ئەو کەسانە هەموو رووداوەکانی دوای راپەرینیان لەبیر چووبۆوە، کێ بوون ئەو کەسانەی بە ئاشکراو ژێراو ژێر دەستیان لەگەڵ دوژمنانی ئەم گەلە تێکەڵ کردبوو، کە لە

ئێستادا، دوای ڕووخانی ڕژێمو ئاشکرابوونی بەڵگەنامە نهێنییەکان ئەمە زۆر ڕوونو ئاشکرایە، بۆیە بە ناهەق تەشهیریان پێکردمو بە نوێژی نیوەڕۆ هەقیقەتەکانیان شێواند تا کار گەیشتە ئەوەی هەفتەنامەی گوڵان لە بەرگی ناوەوەی نووسی بووی یەکەم کەس کەمال سەعدی درکاندی: کێی تریش ئازایە لە کاتێکدا من نەك ئەمەم نەووتبوو، بۆیە بڵاوبوونەوەی ئەو هەفتەنامەیە زۆر کاری تێکردم ناچاربووم بێدەنگی بشکێنمو لە ٢٠٠١/٧/٩ڕوونکردنەوەیەك بۆ ئەنجومەنی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی هەرێمی کوردستان بنێرم، کە ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی:

هەفتەنامەی گوڵان لە بەرگی دواوە دیوی ناوەوە لە ژمارە (٣٣٧) ی ٢٠٠١/٧/٤ داو لە سایتی ڕیکلامی گوڵان لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت لەسەر زمانی من بوختانێکی زلو زەبەلاحی پێکردوومەو بەشێوەیەکی زمنیش جوێنی پێداوم، بەبێ گوێدانە هیچ دابو نەریتێکی ڕۆژنامەوانیو یاساکانی ڕۆژنامەوانیو یاسای چاپەمەنی، ئەمەش خۆی لە خۆیدا سابیقەیەکی ترسناکەو هەڕەشەکردنە لە سومعەو شەرەفی هاوڵاتیانو جۆرێکیشە لە تەحریزکردنی خەڵك بۆ کوشتن.

شایەنی باسە، ئەم هەفتەنامەیە لە ژمارە ٣٣٧ و لە سایتی ڕیکلامەکەیدا لەسەر تۆڕی ئەنەرنێتدا لە ئێوارە گوڵان ژمارە ٩٢٩ تەموزی ٢٠٠١ وتارێکی نووسیوەو تیایدا دەڵێ: ((پاش دەساڵ ڕاپەڕینو دەیان ساڵ خەباتو دەردەسەریو قوربانی خەڵکی کوردستانو پێشمەرگە، تازە مامۆستایەکی زانکۆ، نەك لەژێر لێوەوە یان بە دزیەوە، بەڵکو لەسەر ڕووبەری ڕۆژنامەیەکی تیراژ چەند هەزار دانەیی دەنووسێ : من بەعسیمو بەعسیشم لە هەمووتانو کوردستان خۆشتر دەوێ)).

لە ڕاستیدا، (ن.س.و) لە لاپەڕە دووی ڕۆژنامەی میدیا ژمارە ٩٨ ڕۆژی ٢٠٠١/٦/١٦ تەعلیقێکی لەسەر نووسینێکی من دابوو دژی ئەمریکا، منیش لە

هەمان ڕۆژنامەداو لە هەمان لاپەڕەدا وەڵامم دابۆوەو تیایدا تەئکیدم لەسەر هەڵوێستی خۆم کردبۆوە بەرامبەر ئەمریکاو لە دوورو لە نزیکەوە باسی بەعسم نەکردووەو نەشم ووتووە من بەعسیم بەڵام نازانم هەفتەنامەی گوڵان مەبەستی چیە لە هەڵبەستنی ئەم بوختانەو بۆ دەیەوێ خەڵکم لێ تەحریز بکات گوایە من بەعسیم بەعسم لە هەموو خەڵكو کوردستانیش خۆشتر دەوێ!!

ئەم کارەی هەفتەنامەی گوڵان دەرهەق بە من کردوویەتی دژ بە مافی مرۆڤەو سەرپێچیکردنێکی ئاشکرای جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤە هەروەکو لە بەندی ١٢ ی ئەم جاڕنامەیەدا هاتووە — نابێت هیچ کەسێك ناووناوبانگی وەبەر پەلامار بکەوێت— هەروەها دژ بە ماددە/ ٢٣٣و ٢٣٤ ی یاسای سزادانی عێراقیو ماددە/ ١٠ ی یاسای چاپەمەنی هەرێمی کوردستانو دژ بە هەموو دابو نەریتێکی ڕۆژنامەوانیو کۆمەڵگەی کوردەوارییە بۆیە لە بەڕێزتان داواکارم وەکو سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان سەرنووسەرو بەڕێوەبەری نووسینی ئەم هەفتەنامەیە سزابدرێنو بڕیاری سەندیکاش لەوبارەیەوە لە بەرگی دواوەی هەفتەنامەی گوڵان لە هەمان شوێن بڵاوبکرێتەوە).

هەروەها لە ڕێگای کتێبخانەکانی شاری هەولێرو چایخانەی مەجكۆ لە ڕێکەوتی ٢٠٠١/٧/١٥ڕوونکردنەوەیەکی ترم بڵاوکردەوە تیایدا بەرپەرچی گشت ئەو بوختانو ئیفترایانەم دایەوە کە دەرحەق بە من لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەدا کرابوون.

ئیتر ئەوەبوو لە ٢٠٠١/٧/٢٤ ئەنجومەنی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان بەیاننامەیەکی لە ڕۆژنامەوگۆڤارەکانی کوردستان بڵاوکردەوەو وێنەیەکی پێدام کە ئەمەش دەقەکەیەتی: (( ماوەیەکە لەسەر ڕووبەری ڕۆژنامەکانو لە کەناڵەکانی دیکەی ڕاگەیاندندا لێرەو لەوێ لە پەنای ئازادی

ڕۆژنامەنووسییەوە وتارو بابەت بڵاودەکرێتەوەو تانەو تەشەر لە سەروەری نیشتمان‌و ئەزموونەکەمان‌و هەروەها تانەو تەشەر لە هەندێ کەس‌و لایەن دەدرێ‌و ئەم حاڵەتەش جۆرێك لە پاشاگەردانی خولقاندووەو بووەتە مایەی درووستبوونی نیگەرانی لە ناوەندی ڕۆژنامەنووسی‌و ڕۆشنبیریدا.... بۆیە ئێمە وەك ئەنجومەنی سەندیکای ڕۆژنامەنووسان لە ئاست ئەو مەسەلەیەدا پێمان باشە بەم شێوەیە هەڵوێستی خۆمان ڕوون بکەینەوە:

– سەندیکای ڕۆژنامەنووسان وەك هەمیشە جەخت لەسەر چەسپاندنی ئازادی ڕۆژنامەنووسی دەکاتەوە کە هەر لە سەرەتاوە دروشمی سەرەکی سەندیکا بووە.

– سەندیکا پاراستنی ئەزموونی گەلی کوردستان بە ئامانجی سەرەکی خۆی داناوەو هەر هەوڵ‌و نووسینێك کە زیان بەو ئەزموونە بگەیەنێ بە جۆرێك لە قازانجی داگیرکەران‌و ناحەزانی کوردستان بێت، بە توندی ڕیسوای دەکات.

– سەندیکا دژی هەموو جۆرە ناوو ناوزڕاندنێکە کە دەرهەق هەر کەس‌و لایەنێك بکرێ چونکە پێچەوانەی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانەو بەزاندنی سنووری ئازادی ڕۆژنامەنووسییە لە کوردستان.

بۆیە ئەنجومەنی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان داوا لە گشت ڕۆژنامەنووسان‌و ئەندامانی خۆی دەکات کە ڕەچاوی ئەو خاڵانە بکەن‌و ڕێگەنەدەن کەناڵەکانی ڕاگەیاندن بۆ تانەو تەشەر لە ئەزموونەکەمان و مهاتەرات‌و ناوزڕاندن بەکاربهێنرێ‌و ببنە ئامرازێك بۆ وروژاندنی هەرزان بایی، بەجۆرێك کەلە ئاکامدا دوژمنان‌و ناحەزان بتوانن وەك کەلێنێك لێ یەوە دزەبکەن بۆ نێو هەرێمی کوردستان‌و کار لەسەر تێکدانی ئەو تەبایی‌و یەك ڕیزیە بکەن کە بووەتە کۆڵەکەی پتەو بۆ پاراستن‌و بەرەو پێشبردنی ئەزموونەکە هەروەکو لە برگەکانی (٥–٦–٧–٨) ماددەی (٢٠)ی یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستاندا هاتووە)).

شایەنی باسە، لە باروودۆخێکی دەروونـی زۆر خـراپ دابـووم، چـونکە لـە ولأتی ئێمە قسەی خراپ زوو بلأو دەبێتەوەو بە ئاسانیش دەچێتە مێشکەوەو بەزۆریش خەڵکی ئەوەندەی باوەڕ بەمانە دەکەن باوەڕ بە ڕاستییەکان ناکەن ئــیتر بــەبێ ئــەوەی بگەڕێنــەوە بــۆ ڕاســتی ڕووداوەکــان هــەر دەڵــێن وابوو..وابوو...وایانووتو وا دەڵێن! !

ئێوارەیەك زۆر دڵم تـەنگ بـوو، لـە مـاڵی بـاوکم بـووم تـا درەنگـی شـەو نەگەڕامەوە ماڵەوە، کاتێك چوومەوە، هاوسـەرەکەم ووتـی ئیمـڕۆ ئێـوارە لـە نووسـینگەی تایبـەتی نێچـیرڤان بـارزانی سـەرۆکی حکومـەت ناردبوویـان بـە شوێنتو ئەم ژمارە تەلەفۆنانەشیان بۆت بەجێ هێڵاوە.

دوای ئـەوەی تەلـەفۆنم بـۆ کـردن، بـرای بـەڕێزم کـاك بـەدران ئەحمـەد حەبیب کە ئەوکاتە سکرتێری ڕۆژنامـەوانی سـەرۆکی حکومـەت بـوو، وەڵامـی دامــەوە دوای دڵدانــەوە ووتــی بــەیانی ئۆتۆمۆبیلێــك دەنێرینــە دوات کــاك نێچیروان دەیـەوێ سـەبارەت بـەو تەشـهیرەی دەرحـەق بـە ئێـوەکراوە بتـان بینێـت. جـا ئـەوەبوو بـۆ بەیانیەکـەی لەگـەڵ نـاوبراو چـووینە نووسـینگەی تایبـەتی کـاك نێچـیرڤان بـارزانی کـە ئەوکاتـە سـەرباز هـەورامی بەرپرسـی نووسینگەکە بوو، ووتی دوێنێ سەرۆکی حکومـەت نیـازی هـەبوو بتـان بینـێ بەڵام وادیارە ڕێك نەکەوت، بۆیـە بـۆی نووسـیوم کـە مـن لـەجیاتی بـەڕێزیان چاوم پێت بکەوێو بەناوی ئەوە وە داوای لێبووردنت لێ بکەین کە لە دەزگای گوڵانەوە ئەم ناهەقیەتان بەرامبەر کراوەو جەنابیان دەڵێن چی دەوێ تا بۆی بکەین. منیش سوپاسی سـەرۆکی حکومـەتم کـرد بـۆ ئـەم بەدەنگەوەهاتنـەو ووتم دەکـرێ جـارێ بـزانم جـەنابیان چـۆن قەناعـەتیان بـۆ دروسـتبووە کـە ناهـەقیم بەرامبـەر کـراوە؟ فـایلێکی لەبەردەسـت بـوو پێـی دامو ووتـی دوای لێکۆڵینـەوەو بـە دواداچـوون بـۆ ڕووداوەکـە ئـەم بڕیـارەی لادروسـت بـوو. ئــەوەبوو دوای خوێندنــەوەی ئــەو یاداشــتنامەیەی کــە لەلایــەن کەســانی

نووسینگەکەی سەبارەت بە زروفو مولابەساتی ڕووداوەکە بۆی بەرز ببۆوە، کە تیایدا زۆر بەوردی ئاماژە بەوتارەکەی منو ئەو کەسانەکرابوو کە ڕەخنەیان لێ گرتبووم تا دەگاتە ڕیکلامەکەی هەفتەنامەی گولآن کە دەستەواژەیەکی زۆر قێزەونی تیا هاتبوو، هەروەها لە تەنیشت هەر ناوێك لە ناوی ئەو کەسانەی بەدواداچوونیان بۆ ووتارەکەی من کردبوو پێناسەیەك کرابوو کە نامەویّ لێرە ئاماژەیان پیّ بکەم.

دوای ئەوەی گشت یاداشتنامەکەم خوێندەوە، بە سەرباز هەورامیم ووت من زۆر سوپاستان دەکەم بۆ بەدەرخستنی ئەم ڕاستیانە، بەلآم حەزدەکەم بزانم دوای گەیشتن بەم ئەنجامە کاك نێچیرڤان بارزانی سەبارەت بەو دەزگایەو ئەو کەسانەش ووتی چی؟ سەربازهەورامی وەلآمی دامەوە ووتی جەنابیان ووتی چارەنووسێکی ڕەشیان بۆخۆیان تۆمارکردو داواشیکرد بەدوات بنێرینو داوای لێبووردنت لێ بکەینو بزانین چیت دەویّ تا بۆتی بکەین. ووتم من سەبارەت بە دەزگای گولآن هیچ نالێم چونکە کاك نێچیرڤان خۆی سەرپەرشتیاری دەزگاکەیە ئەو بڕیارە بۆ خۆیان بەجیّ دەهێلّم بەلآم سەبارەت بەو کەسانەی تەشهیریان پێکردووم ڕێگای دادگا دەگرمەبەر.

هەر لەوکاتەدا کاك بەدران ئەحمەد حەبیب کۆپییێکی نووسینێکی خۆی بە ناونیشانی — لەبارەی ڕۆشنبیرو مامۆستای زانکۆ بەڕێز کەمال سەعدی— دامیّو ووتی من ئەم نووسینەشم لەبارەی ئێوەوە خستبووە بەردەم کاك نێچیرڤان بارزانی، زۆری بەدلّ بوو، با لای خۆت بێت، کە ئەمەش دەقەکەیەتی: ((لەماوەی چەند ڕۆژی ڕابردوودا، چەند وتارێکم لە (میدیا)و هەفتەنامەی (گولآن) لەبارەی هەلّوێستی سیاسی نووسەرو مامۆستای زانکۆ کەمال سەعدی خوێندەوە. سەرەتا زۆر سەرسام بووم کەوا نووسەرو ڕۆشنبیرێکی کوردستان لەناوجەرگەی پایتەختی هەرێمدا هەلّوێستی هێندە نالەبارو دژبیّ لە ئاست دۆزی ڕەوای گەلەکەی. بە تایبەتیش کەمال سەعدی

کە زیاتر لە پازدە ساڵە لە نزیکەوە دەیناسم. لەسەردەمی پێش ڕاپەڕیندا یەکێك بوو لەوانەی قەڵەمی خۆی نەدۆڕاندبوو، بگرە هەر لە پێناوی ڕاستیو کەلتووری کوردیو خۆشەویستیی وڵاتەکەیدا بووە. جگە لەمەش، مرۆڤێکە لە چینە هەژارو ڕەشوڕووتەکانەوە پێ گەییوەو بە ڕەنجی شانی خۆی بەردەوام بووە. لەم ساڵانەی دواییشدا، یەکێك بووە لەوانەی بەگەرمی بۆ بە کوردی کردنی زاراوەو دەربڕینەکانی یاسا کاری کردووە.

لەبەر ئەم هۆیانە، بە پەلە گەڕامەوە سەر ووتارەکەی ژمارە (۹۹) ی میدیا کە کەمال سەعدی بۆ بەرگریکردن لەخۆی نووسیبووی. زۆر خۆشحاڵ بووم کە بینیم هیچ ناوو ناتۆرەیەك لە وانەی دراونەتە پاڵی ڕاست نینو هەرگیز شتێکی نەگوتووە کە بەم جۆرە بێ بەزەییانە شی بکرێتەوە. بە پێچەوانەوە، هەڵوێستی کوردایەتیو نیشتمانپەروەریو دڵسۆزیی خۆی بە ئاشکراو ڕاشکاوی ڕاگەیاندووە. ئەم نووسەرە، تەبای نووسەرانی تری کوردستان لەپاڵ دۆزی ڕەوای گەلەکەیو ئێشو ئازارەکانیدایە. حەیفە لە هیچو خۆڕایی ڕۆژنامەو بڵاوکراوەکانی خۆمان بکەین بە بواری ناوزڕاندنو پەلاماردانی ڕۆشنبیرانو کەسانی خزمەتگوزار. هێندە ئاسان نییە لە لاپەڕەی ڕۆژنامەو ئینتەرنێتدا تۆمەتی ناپاکیو نانیشتمانپەروەری بدرێتە پاڵ خەڵك. ڕاستە لەم سەردەمەی ئێستادا ئازادیی ڕۆژنامەوانیو ڕاگەیاندن زۆر فراوانو بەربڵاوبووە بەڵام نابێ لاسایی گەلانی زۆر پێشکەوتوو بکەینەوە. هێشتا لە وڵاتی ئێمە هەزارو یەك فاکتەر هەنکە داوا دەکەن ئابڕووی خەڵك پارێزراو بێ. من لەو شوێنە نیم کە ئامۆژگاری نووسەرە لاوەکان بکەمو بە مافی خۆمی نازانم ڕێگە پیشانی خەڵك بدەم بەڵام هاندەرم لەم نووسینەدا هەستی بەرپرسیاریم بوو بەرامبەر ڕۆشنبیرێکی کوردو هاوەڵێکی خۆم. دوای بڵاوبوونەوەی ئەو وتارانە، (کەمال سەعدی) م لە بارێکی زۆر پەرێشانیو هەست بریندکراویدا بینی. ئەگەر زوو فریا نەکەوتایەم لەوانەبوو لە بێ

چارەسـەری‌و لـە داخـی تیروتـوانجی خـەڵك ئـاگر لـە كتێبخانەكـەی خـۆی بەربدات.

بـۆ دڵنیـاكردن‌و ڕاگرتنـی هەسـتی كـەمال سـەعدی ئـەم وتـارە كورتـەم نووسی. هیوادارم خۆڕاگربیّ‌و ئەم جۆرە ڕەشەبایانە نەیهەژێنیّ. گلـەییش لـە نووسـەرانی هـەولێرو هـاوەڵانی كـەمال سـەعدی دەكـەم كـە بێـدەنگ بـوون‌و كەسیان بەرگرییان لێی نەكرد)).

جـا دوای ئـاڵوگۆڕكردنی نوێنـەر لـە نێـوان مـن‌و سـەرۆ قـادر بەرپرسـی دەزگـای گوڵان،گەیشـتینە ڕێككـەوتن بـە بڵاوكردنـەوەی ڕوونكردنەوەیـەك‌و داوای لێبووردن كردن لە هەمان شوێن‌و بە هەمان قەبارە لە هەفتەنامەكەیدا، هەروەها ئاراستەكردنی سزای ئیداری بۆ ئەو كارمەندەی كە ڕیكلامـە تەشـهیر ئامێزەكـەی كردبـوو، جـا ئـەوەبوو لـە ڕۆژی ٢٠٠١/٧/١٦ لـە سـایتی ئێـوارە گوڵاندا و هەروەها لە هەفتەنامەی گوڵان ژمارە (٣٣٩) لـە سـاڵی ٢٠٠١لـە ژێـر ناوونیشـانی كـەمال سـەعدی ... ببـورە پۆزشـی هێنایـەوە كـە ئەمـەش دەقەكەیەتی: ((بە پێویستی دەزانم، لەسەر ئەو پارچە نووسینەی لـە بـەرگی سـێیەمی ژمـارە ٣٣٧ ی هەفتەنامـەی گوڵانـدا، وەك ڕیكـلام بـۆ سـایتی ئینتەرنێتی دەزگاكەمان بڵاوكرابۆوە، داوای لێبوردن لە بەڕێز كەمال سـەعدی بكەم، چونكە جۆرێك لە ناحەقی لە عەرزكردنی چەند وتارێكی دیكەدا پەیڕەو كراوەو بووەتە مایەی گلەیی مامۆستای ناوبراو. ئێمە لە گوڵانـدا ڕێگامـان بـە خۆمـان نـەداوە، گۆڤارەكانمـان ببێتـە شـوێنی ئـازاردان‌و تـەنگاوكردنی ڕۆشنبیران، بۆیەش ئـەم ڕوونكردنەوەیـەم بـە پێویسـت زانـی. سـەرۆ قـادر: بەڕێوەبەری گشتی دەزگای ڕۆشنبیری‌و ڕاگەیاندنی گوڵان )).

بـەڵام بـەهۆی ئامادەنـەبوونی ئـەوانی تـر بـۆ پـۆزش هێنانـەوەو داوای لێبووردن كردن، لە ڕێكەوتی ٢٠٠١/٧/٢١داوام لـە دژی هەریـەكێك لـە (ع.ع)و (ڕ.م)و (ب.ش) بۆ دادگای لێكۆڵینـەوەی شـاری هـەولێر بـەرزكردەوە، بـەڵام

بەهۆی خۆنەدانە دەستەوەو دەستێوەردانی کەسانێکی بەرپرس کە نامەوێ ناویان بهێنم کێشەکە بە هەڵپەساردراوی مایەوە، بەڵام لەو ماوەیەشدا کەسانێك ناوبژیوانییان دەکردین بۆ گەیشتن بە ڕێککەوتنێكو داخستنی دۆسیەکە، لەوانە برای بەرێزم حاکم تۆفیق سەرۆکی یەکێتی مافپەروەرانی کوردستانو دکتۆر محەمەد هەمەوەندیو دکتۆر کامەران ساڵەییو برای بەڕێزم نەژدەت ئاکرەیی ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو، لە ئاکامدا لەگەڵ ئەوانیش گەیشتینە ڕێککەوتن کە خۆیان بدەن بە دەستەوەو لەبەردەم بنکەی پۆلیسی خانەقاو دادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر ئامادەبنو لە ئیفادەکانیاندا بەڕاشکاوی خۆیان بە هەڵەبار دابنێنو داوای لێبووردن بکەن ئەوسا لێیان خۆش دەبم. جا ئەوەبوو ناوبراوان لەبەردەم بنکەی پۆلیسی خانەقا کە ئەوکاتە نەقیب ئەسکەندەرکەریم حەمەد بەرپرسی بنکەکە بوو هەروەها لەبەردەم دادگای لێکۆڵینەوە کە ئەوکاتە دادوەر نەشئەت ئەحمەد ڕەشید دادوەری لێکۆڵینەوە بوو ئامادەبوونو ئەوەیان کرد کە لەسەری ڕێککەوتبووین بۆیە لە داوای خۆم خۆش بووم بەو مەرجەی کۆپییەکی پەراوەکانی دۆسیەکەم پێ بدرێت، بە سوپاسەوە جەنابی دادوەری لێکۆڵینەوە ڕەزامەندی نواندو کۆپییێکی دۆسیەکەی دامێ.

## چۆن مۆڵەتی کتێبخانەی زەردەشتم وەرگرت

لە ساڵی ١٩٧٥ تەنها چەند کتێبخانەیەك لە شاری هەولێر هەبوون کە بە پەنجەی دەست دەژمێردران، لەوانە کتێبخانەی سۆلاڤو خۆشناوو عەسکەریو تەئمیمو کوردستانو حەیدەریو اربیلو سەربەستی، بازاڕی کتێبو بڵاوکراوە کوردییەکان زۆر گەرمو گوڕ بوو، تەنانەت دوای ئەوەی شۆڕشی کورد لە باشوری کوردستان تێك چوو، کتێبخانەکان بوونە مەڵبەندی ڕۆشنبیریو کوردایەتیو نووسەرانو ڕۆشنبیران لە دەوریاندا کۆبووبوونەوەو لەوکاتەدا کردنەوەی کتێبخانەیەکی کوردی وەك کردنەوەی بارەگایەکی حزبی شۆڕشگێڕی وابوو، بۆیە نەك تەنها خەڵکانی ڕۆشنبیر، بەڵکو هەندێك لە سیاسەتمەدارانی کوردیش بەوچاوە دەیانڕوانییە کتێبخانەو دەیانکردەوە لەوانەمامۆستا گیوی موکریانیو مومتاز حەیدەری دوو نموونەی بەرچاون. جا ئەوەبوو لە ساڵی ١٩٧٥ منیش وەکو ئەو بەڕێزانە ئەو خولیایە کەوتە مێشکمەوەو بۆ ئەم مەبەستە سەردانی دیوانی پارێزگای هەولێرم کردو داخوازییێکم پێشکەش کردن بۆ کردنەوەی کتێبخانەیەك بەناوی (زەردەشت)، هەر بۆیەش ناوی زەردەشتم بۆی هەڵبژارد چونکە لەو کاتەدا من یەکێك بووم لە هەوادارانی ئاڤێستاو زەردەشتو تەنانەت بە پێغەمبەری کوردانیش تەماشام دەکردو ئەوکاتە ئاڤێستا لای من وەکو ئینجل وابوو، تەنانەت بۆخۆشم هێندەشانازیم بە نەتەوەکەم نەتەوەی کورد دەکرد، هەر لەو سۆنگەیەوە دەمویست ناوی خۆشم بگۆڕمو بیکەم بە کاردۆخ بەوەی کە ئەسڵی ناوی نەتەوەی کورد لە کاردۆخییەوە هاتووە، بۆ ئەم مەبەستە سەردانیدادگاشم کرد، بەلام ووتیان ڕێوشوێنی یاسایی زۆری دەوێ، بۆیە پەشیمان بوومەوە.

بەهەرحاڵ، دوای ئەوەی داخوازییەکەم بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی کردنەوەی کتێبخانە ڕێچکەی خۆی وەرگرت، نزیکەی چوار ساڵو نیوی خایاند تا

ئیجازەیان پێدام. لە ڕاستیدا لەو ماوەیە زۆر ماندوو بووم لەبەسەرکردنەوەی دیوانی پارێزگا بۆ بەدواداچوونی مەعامەلەی کردنەوەی کتێبخانەکەم، هەروەها زۆریش پەشیمان بووم لە پێشکەشکردنی ئەم داخوازییە، چونکە زۆر قورستر بوو لەوەی پێشبینم دەکرد، بەو هۆیەوە لەلایەن فەرمانگەی ئەمنو لایەنە پەیوەندیدارەکان لاپەڕەکانی ژیانی ڕابردووم هەڵدرایەوەو ناوە ناوە بانگێشتی فەرمانگەی ئەمنیان دەکردمو کۆمەڵێك پرسیاریان لێدەکردم، منیش بۆخۆم ماوەیەکی کەم بوو لەسەرەوە هاتبوومەوەو وەزعی کوردیش زۆر باش نەبوو، بۆیە زۆر دەترسام تووشی گێچەڵێك بم بە تایبەتی حەساسیەیان بەرامبەر ناوەکەی هەبوو دەیانووت بۆ ناوت ناوە زەردەشت؟ منیش دەمووت هەروا چونکە ناوەکەی سووكو ئاسانە. بەڵام ئەوان زۆر قەناعەتیان پیێ نەبوو، بۆیە هێندەیان ماندوو کردم تا وای لێهات جارێك کە ناردیان بە شوێنم بۆ هەندێ ڕوونکردنەوە، ووتم من پەشیمانم لە کردنەوەی کتێبخانەو دەمەوێ داوایەکەم بکێشمەوە. بەڵام ئەوان ڕازی نەبوونو ووتیان ئەمە دوا بانگێشتکردنتە بۆ ئێرەو ئیجازەت پیێ دەدەین. جا ئەوەبوو پارێزگای هەولێر ناسنامەی فرۆشتنی چاپەمەنی بە ژمارە (٩) ڕۆژی ١٩٧٩/١٠/١٦ بە ئیمزای پارێزگار بهاوالدین احمد بۆ دەرکردم.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، لەو ماوەیەدا من لە ئەمینداریێتی شارەوانیو هاوینەهەوارەکان دامەزرام، بەڵام وێڕای ئەوەش خۆشەویستیم بۆ کتێبو کتێبخانە وایانکرد کە سارد نەبمەوەو سووربم لەسەر کردنەوەکەیدا. بۆیە لە ڕێگای گرێبەستی موساتەحە لە ١٩٨١/٢/٢پارچە زەوییێکی بچووکم لە سەرەتای شەقامی پزیشکان لەو شوێنەی کە ئێستا باڵاخانەی وشیار ئەتروشی لێیە بە کرێی ساڵانە بەبڕی شەستو چوار دینار بۆ ئەم مەبەستە وەرگرتو لەلای ئاسنگەر کوشکێکی سەفەریم بە سێسەد دیناری سویسری دروستکردو بە لۆرییێکی فلات هێنامەوەو بە کرێن لەو شوێنە دام بەزاندو

عبدالباسـت فــەرهادی کــە ئەوکاتــە لێکۆڵــەوەری دادی بــوو لــە دادگــای لێکۆڵینــەوەی هــەولێر، خۆبەخشــانە بــە خەتــە جــوانو ڕەنگینەکــەی نــاوی کتێبخانەکەی بۆ نووسیم.

بەڵام ئەوەی جێی داخە من هێشتان لە ڕێکخستنی کتێبخانەکـەم نـەبوو بوومەوە کە ناوی سەربازیم هاتو بەو هۆیەوە لە هەولێر دوور کەوتمەوەو بۆ مەشـقکردن چـەند مانگێـك لـە شـاری بەغـدا مامـەوەو دواتـریش دوای گواستنەوەی فەوجە سەربازییەکەمان بۆ بەرەکانی جەنگ لە جەنگی عـیراقو ئێران ڕامکرد بەمەش نـەمتوانی کتێبخانەکـە بکەمـەوە. هـەر لـەو ماوەیەشـدا وشیار ئەتروشی کە خاوەنی ئەو پارچە زەوییـە بـوو کـە کـەوتبووە تەنیشـت شـوێنی کتێبخانەکـەی منـەوەو دەسـتیکرد بـە دروسـتکردنی باڵاخانەکـەیو ووتــی بــۆ ئــەم کوشــکەم پــێ نافرۆشــیتەوە مــن بــۆ پاســەوان ســوودی لێ وەردەگرم؟ منیش ئەوکاتە هیچ ئومێدێکم بە دەربازبوون لە سەربازی نـەبوو، لەبەر ئەوەی لە سەربازیش ڕامکردبوو، مووچەکەم بڕابوو، بۆیە زۆر پێویسـتم بـە پـارە بـوو، بۆیـە لەگـەڵی ڕێککـەوتمو بەمایـەی خـۆی دامـەوە پێـیو لـە ١٩٨٣/١٢/٢٤ کۆتــاییم بــە گرێبەســتەکەم هێنــا لەگــەڵ بەڕێوەبەرایــەتی شارەوانی هەولێر، بەمـەش خـەونی کردنـەوەی کتێبخانەکـەم بـۆ هەتاهەتایـە کەوتە ژێر گڵەوە.

## مامۆستا بووم لە بنکەی نەهێشتنی نەخوێندەواری

وەکو لە سەرەتاوە باسمکرد، باوکم شوفێرێکی کەم دەرامەت بوو لە فەرمانگەی میری، بۆیە بۆ دابینکردنی خەرجیەکانی خۆمانو پارەی گیرفان، منو براکەم هاوینان لای وەستا عەلی باداوەیی کە دراوسێمان بوو لە گەڕەکی موفتی بە ڕۆژانە کرێکاریمان دەکردو زۆر ماندوو بووین بۆیە کە لە ساڵی ١٩٧٥تەمەنی هەژدەساڵیم تەواو کرد زۆر دڵم خۆش بوو بەوەی کە مەرجی سەرەکی دامەزرانم تیا هاتۆتە دی. جا ئەوەبوو لەو دەمەدا حکومەت هەڵمەتی نەهێشتنی نەخوێندەواری لە سەرتا سەری وڵات دەستپێکردبوو، بەو هۆیەوەش هەرکەسێك ناوی ژمارەیەك نەخوێندەواری کۆبکردایەتەوە بنکەیەکی نەهێشتنی نەخوێندەواریان بۆی دەکردەوەو بە گرێبەست بۆ ووتنەوەی وانەکان دایان دەمەزراند. جا ئەوەبوو ئەوکاتە کە ئێمە شەش حەوت ماڵ بووین لە گەڕەکی موفتی لەسەر ڕێگای باداوە، ئەوکاتە باداوەگوندێکی بچووك بوو، چەند ماڵێکی لێ بوو کە هەندێکیان کرێکاریو جووتیاریان دەکردو زۆربەی پیاوە بەتەمەنەکانیشیان نەخوێندەوار بوونو هیچ بنکەیەکی نەهێشتنی نەخوێندەواریشیان بۆ نەکرابۆوە، بۆیە ئەم هەڵەم قۆستەوەو سەردانیانم کردوو لیستێکم بەناوی نەخوێندەوارەکانیان ئامادەکردو دوای وەرگرتنی پەنجەمۆریان پێشکەشی بەڕێوەبەرێتی نەهێشتنی نەخوێندەواری شاری هەولێرمکرد کە ئەوکاتە لەلایەن مامۆستا محمدامینمحەمەد ساڵح بەڕێوەدەچوو.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، دوای ئەوەی لە ڕێکەوتی ١٩٧٥/٨/١٨ فەرمانی دامەزراندنم بۆ دەرچوو وەك وانەبێژو ئەرکی بەڕێوەبردنی بنکەکەشم پێسپێردرا، نووسراوم بۆ هەردوو بەڕێزان یاسین ئەکرەم کانیو عبدالستار رەحمان کرد کە یەکەمیان دراوسێمان بوو ئەوەی تریش ماڵی لە گەڕەکی بەلاشاوە بوو لای خۆم وەك وانەبێژ دامەزراندن.

تـا ١٩٧٦/٦/١٩ لـەو بنکەیـە مامـەوەو لەڕێکـەوتی ١٩٧٦/٦/١٣بـە شـێوەیەکی فـەرمی لـە ئەمینـدارێتی گشـتی شـارەوانیو هاوینەهـەوارەکان دامەزرامو بەو هۆیەوە وازم لە ووتنەوەی وانە هێنا.

بۆمن ئەو ئەزموونە زۆر گرینگ بـوو، وێـڕای ئـەوەی شـارەزاییێکی باشـی پێ بەخشیم لە بواری وانە ووتنەوە، لـە هـەمان کاتـدا دەسـکەوتێکی مـاددی باشیشی بۆمن تیابوو، تەنانەت توانیم بە بڕێك لەو پارەیەی کە مانگانـە وەرم دەگرت یارمەتی فارسی برام بدەم کە ئـەو کاتـە قوتـابی کۆلێـژی ئەنـدازیاری بوو لە زانکۆی سلێمانی.

## ئەزموونی پارێزەریم

دوای دەرچوونم لە کۆلێژی یاساو وەرگرتنی بڕوانامەی بەکالۆریۆس لە یاسادا، خولیای پیشەی پارێزەرێتیمکەوتە مێشکەوە، کە هەر لە منداڵیەوە هەمبوو، هەروەکو پێشتریش ئاماژەم پێی دا، مامۆستا عومەر شێخەللآدەشتەکی کە مامۆستای وانەی کوردیمان بوو لە قوتابخانەی سۆرانی سەرەتایی هەر لە پۆلی چوارەمی سەرەتاییەوە ئەو نازناوەی لێ نابوومو کێشەکانی قوتابیانی لەسەر دەستی من یەکلا دەکردەوە. جا ئەوەبوو دوای دەستبەکاربوونەوەم لە فەرمانگەکەم (ئەمینداریێتی گشتی شارەوانیو هاوینەهەوارەکان) دوای چەند مانگێك خۆم خانە نشین کردو بوومە ئەندام لە نەقابەی پارێزەرانی عێراقو نووسینگەی پارێزەریم لە بەرامبەر قەلآتی هەولێرو لە نزیك مزگەوتی قیبلە خوار لە بالآخانەی ئەسعەدی کردەوەو دەستم کرد بە پیشەی پارێزەری.

بۆ ماوەی زیاتر لە پێنج ساڵ مومارەسەی پیشەی پارێزەرێتیم کردو لەو ماوەیەدا توانیم دەعوایەکی زۆر لەبەردەم دادگاکانی هەولێر ببینم بەتایبەتی لەبەردەم دادگاکانی بەرایی، هەروەها لەپاڵ ئەوەشدا ئیشو کاری زەوىو زارو تەئمینیشم دەکرد. بە درێژایی ئەو ماوەیە هیچ داوایەکی لێکجیابوونەوەی هاوسەرگیریم نەگرتەوە، بەڵکو دەبوومە ناوبژیوانو ئاشتم دەکردنەوە. تەنها جارێك نەبێت پارێزەرێکی هاوڕێم کەیسێکی داوای لێکجیابوونەوەی لەلا بوو، منی کردە ناوبژیوان لەبەردەم دادگای باری کەسی هەولێر، منیش دوای ئەوەی بەدواداچوونم بۆ فایلی کەیسەکە کردوو زانیاری وردم لەبارەی ژنەکە کۆکردەوە بۆم دەرکەوت کە ئافرەتێکی لەشفرۆشەو خاوەنی دوو منداڵیشە، بۆیە وێڕای ئەوەی پیاوەکەی دەستبەرداری نەدەبوو، کەچی من ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلم بۆ دادوەر نووسیو لەبەر ڕۆشنایی ئەو زانیاریانەی کە دەستم کەوتبوون بۆ بەرژەوەندی ئەو دوو

منداڵە جوانو چاوگەشانە هانی دادوەرم دا کـە کەیسـەکە یـەکلا بکاتـەوە بـە لێکجیاکردنەوەی ئەو دوو هاوسەرە. جا ئەوەبوو دادوەریش قەناعـەتی هێنـاو بڕیاریدا.

هـەروەها دوو یـادەوەری تـاڵم لـەو ماوەیـە هەیـە، یەکـەمیان، لـە دوای گرتنی ولاتی کوێت لەلایـەن ڕژێمـی پێشـووەوە، جـارێکی تـر خـەڵك لەلایـەن ڕژێمەوە بۆ سـەربازی دەبردرایـەوە، ئەمـەش بەشـێکی زۆری دایـكو باوکـانی تووشی خەمو پەژارەو بێ ئومێدی کردبـوو، لـە خـەمی منداڵـەکانیان چـونکە هێشــتان شــەڕی عێــراقو ئێرانیــان لــەبیر نەچــووبۆوە، بۆیــە بــە دوای ڕێگاچارەیەك دەگەڕان بۆ دەربازبون لەو کێشەیەو بۆ ئەم مەبەسـتە پـەنایان دەهێنــا بــەر دادگــا. مــنو هەنــدێ پــارێزەری تــر (ك.و، هـ.ڕ، أ.ح، ش.ع)، ڕێگایەکمان دۆزیەوە بۆ بچووککردنەوەی تەمەنی ئەو کەسانەو توانیمان دڵـی زۆر لەو دایكو باوکانە بە بچوککردنەوەی تەمەنی منداڵەکانیان خۆش بکـەین، بەڵام بەداخەوە سـیخوڕەکانی ڕژێـم هـەرزوو فریـا کـەوتنو بـە خراپـی بۆیـان تێگوشینو ئێمەیان بە تاوانی دزینەوەی خەڵك لـە خزمـەتی سـەربازی گـرتو بەپێی مادده/ ٢٩٨و ٢٩٩ی یاسای سزادانی عێراقی ژمـارە ١١١ سـاڵی ١٩٦٩ هەموارکراو ڕاپێچـی دادگـا کـرد، بـەڵام ئـەوەی کـەدەبێ بـووترێ هەڵوێسـتی جوامێرانەی دادگاو فەرمانگەی پۆلیسی هەولێرە، کە نەیانهێشت ئێمە بخەنـە زیندانی محەتەوە، بەڵکو ژوورێکیان لە بنکـەی پۆلیسـی ئـازادی بـۆ تـەرخان کردینو زۆر بە ڕێزەوە مامەڵەیان لەگەڵ دەکردین، تەنانەت بـە ئـازادی لـەناو بنکەکــەدا دەســوڕاینەوە تــا دوای چــەند هەفتەیــەك دادوەری دادگــای لێکۆڵینەوەی هەولێر (ت.د) ئەو مادده یاساییانەی کـە ئێمـەی پـێ تۆمـەتبار کرابـووین گـۆڕی بـە مـادده/ ٢٩٤و لـە ڕێکـەوتی ١٩٩١/٢/٩ لەبـەر کیفایـەت نــەبوونی ئــەو بەڵگانــەی کــە لــەژێر دەســتیان دابــوو، ئێمــەی ئــازادکردو تۆمەتەکەشی لەسەر لادایـن کە ئەمەش دەقـە کەیـەتی : (( ١- قـررت تبـديل

ماده الاتهام بالنسبه لكافه المتهمين الى ٤٨/٤٧/٢٩٤ ق.ع بالنقر لما ورد من تقرير الادله الجنائيه المؤرخ ١٩٩١/١/١٣. ٢- ولعدم كفايه الادله بحق المتهمين (ك.و.ع) و (ك.س.م) و (ر.م.ص) قررت الافراج عنهم والغاو التهمه المسنده اليهم وژلك استنادا الى الماده/١٣٠/ب قانون اصول المحاكمات الجزائيه)) .

یادەوەری دووەمم دەگەڕێتەوە بۆ دوای ڕاپەڕین کاتێك ئیشو کاری پارێزەریم دەکرد، جارێکیان لەناو دادگای شاری هەولێر لەلایەن یەکێك لە خەسمەکان لە کەیسێکی زەویو زاری کشتووکاڵی هەڕەشەی کوشتنم لێکرا ئەگەر لە بەرگریکردن لەو کێسە نەکشێمەوە. ئەوەی جێگای سەرنجە، ئەو کەسەی هەڕەشەی لێکردم بەڕێوەبەری فەرمانگەیەکی سەر بەوەزارەتی ناوخۆی حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو، ڕووتبەی نەقیبی بە تۆزوویا پێدرابوو، هەرچەندە بە هەڕەشەی ئەو من وازم لە کەیسەکە نەهێنا، بەلاّم ئەو توانی هەڕەشە لە شایەتەکان بکاتو وایان لێ بکات کە لە ترسانا شایەتی نەدەن بەمەش دواتر داوایەکەم دۆڕاند چونکە تاکە بەڵگە کە بە دەستمەوە بوو بۆ سەلماندنی داواکە شایەتی بوو. دوای ئەوەی لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوەی دادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر (أ.خ) شکایەتم لە دژی تۆمارکردو سەرەتا نووسراویان بۆ فەرمانگەکەی کرد کە لەبەردەم دادگا ئامادەبێت بەلاّم بەهۆی گوێ پێنەدانەدانیەوە، دادگا ناچاربوو بڕیاری دەسگیرکردنی بۆ دەربکات، کەچی وێڕای ئەوەی شوێنی کارکردنو دانیشتنیشی دیاربوو، کەچی دەستگیرنەکراو بە ئازادی لە فەرمانگەکەی خۆی دەوامی ڕۆژانەی دەکردو تەنانەت ڕۆژێك بۆ بەدواداچوونی گرتنی چومە بنکەی پۆلیسی خانەقا بەرپرسی بنکەکەم دەناسی پێش ڕاپەڕین سکالاّنووس بوو لەبەردەم دادگا بەلاّم دوای ڕاپەڕین سێ ئەستێرەیان پێی بەخشی بوو، لێم پرسی هۆی چیە ئەو تاوانبارە ناگیرێ؟ بە پێکەنینەوە ووتی بەخوا من تۆم زۆر خۆش

دەویَ بەدەستم بێت هەر ئێستا بۆتی دەگرم. منیش ووتم ئەدی بەدەست کێیە؟ ووتی دەبڕۆ ژووری بەڕێوەبەری پۆلیسی بەلدە بزانە کێی لێیە، ئەوجا وەرەوە لامو دوو قسەی لیَ دەکەین. ئەوەبوو منیش چوومە ژووری بەڕێوەبەری پۆلیسی بەلدەو بینیم تاوانباری ناوبراو لە ژوورەوە دانیشتووەو قاچی لەسەر قاچ داناوەوقاوە دەخواتەوە. بە بینینی ئەم دیمەنە مێشك لە کەلەم نەماو یەکسەر گەڕامەوە لای دادوەری لێکۆڵینەوەو داوای تەنازولکردنم لەو کەیسە خستە بەردەمی، ئەویش لەسەری نووسی لەگەلَ پەڕاوەکانی کەیسەکە هاوپێچ بکرێتو فایلەکەی بۆم بێنە تا بڕیاری لەسەر بدەم. جا لە هەمووی ناخۆشتر ئەوەبوو کاتێك چوومە لای بەرپرسی بنکەی پۆلیسی خانەقا، ناوبراو ووتی پێویست بەم ماندووبوونە ناکات، لەگەلَ دەستی خۆت کاغەزەکەت بدڕێنە چونکە ئەسلَەن فایلەکە دەمێکە دڕاوەو هیچ شتێکمان لا نەماوە.

**ویستم ببمە دادادوەر**

لە کۆتاییی ساڵی ٢٠٠١ سەردانی مامۆستا کاکە عبدالکریم بەڕێوەبەری گشتی دادی حکومەتی هەرێمی کوردستانم کردو کتابێکی چاپکراوی نوێی خۆمم بۆی بردو قاوەیەکیشم لای خواردەوە. هەر لە میانی ئەو دانیشتنەدا بەڕێزیان ووتی خۆ ماوەی چەند ساڵێك مومارەسەی پیشەی پارێزەریت کردووە، بۆ نابیتە دادوەر؟ منیش ووتم ڕاستە زیاتر لە پێنج ساڵ خزمەتم هەیەو زۆریشم حەزلێیە، بەڵام خۆ بە حەزو ئارەزووی من نابێت. کاغەزێکی دامێ و ووتی شتێکم بۆ بنووسە بۆتی بەرزدەکەمەوە بۆ جەنابی وەزیر. منیش لەسەر کاغەزەکە نووسیم کە دامبمەزرێنن بە داواکاری گشتی. بەڕێزییان ووتی بۆ داوای دادوەری ناکەی؟ ووتم ئەو داوایەیان زەحمەتە با تۆش ئیحراج نەبیت. ووتی بۆ ئیحراج دەبم خۆ تۆ مامۆستای هەندێ لەوانەشی کە بوونەتە دادوەر، بڕواناکەم کەس بۆ تۆی پێ ناخۆشبێت.

جا ئەوەبوو لە جیاتی داواکاری گشتی داوای دامەزراندنم کرد بە دادوەری. هەر بۆ دوای چەند ڕۆژێك دادوەر ئازاد عزالدین مەلا فەندی بە وەکالەت وەزیری داد بوو لە کۆلێژی یاساش لای ئێمە وانەبێژ بوو وانەی یاسای تەنفیزی دەووتەوە پێی ووتم  داواکارییەکەتم بینی زۆرم کەیف هات. ئیتر بەم شێوەیە دوای چەند مانگێك سەردانی وەزارەتی دادم کردو بەدواداچوونم بۆ داواکارییەکەم کرد، بەڕێوەبەری نووسینگەی وەزیر (م.ر) کۆپییێکی ئەو دوو نووسراوە نهێنیەی دامێ کە بۆ دامەزراندنم ئاراستەی ئەنجومەنی دادوەریو یەکێکی تریش کە ئاراستەی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران کرابوون بە ژمارە ٤٤/١ لە ٢٠٠١/٩/٤و ٤١/٣/٢ لە ٢٠٠٢/٤/٢، بەڵام دوای چاوەڕوانییێکی زۆر نە بە بەڵێ وە نە بە نەخێر وەڵامم نەدرایەوەو منیش لێی بێئومێد بوومو وازم لێی هێنا.

ئەوەی شایەنی باسە، ڕۆژێك سەردانی یاریدەدەری ڕاگری كۆلێژەكەمان (د.ع.ی) كردو سڵاوم لێی كرد، یەكێكی لەلا بوو پێی ناسانم ووتی ئەوە كاك (ب.ص)ە، وابزانم یەكتر ناناسن؟ ووتم نەخێر پێشتر نەمناسیوەو پێخۆشحاڵم بە ناسینی. دوای ئەوەی منیش خۆم پێی ناساند، بەزەردەخەنەیەكەوە ووتی ئەگەر پێشتر تۆم بناسیبای تۆ ئێستا دادوەر بووی. منیش ووتم جا دادوەری چ پەیوەندییێكی بە تۆوە هەیە؟ ووتی چۆن من بەرپرسی فڵانە شوێنمو بۆ دامەزراندنی تۆ سامی عبدالرحمن جێگری سەرۆكی حكومەت پرسی بە من كرد، منیش ووتم نایناسم، بۆیە تۆ دانەمەزرایت، زۆر داوای لێبووردنت لێ دەكەم من خۆم بە قەرزاری تۆ دەزانم ئێستا هەر ئیشێكت هەبێت بۆتی دەكەم. منیش بە پێكەنینەوە ووتم زۆر سوپاس كە ئەو چاكەیەت پێ نەكرا. ووتی بەخوا هیچی خراپم نەووتوە تەنها ووتوومە نایناسم. منیش ووتم جا نەناسینی ئێوە بۆ كەسێك مانای خراپی ئەو كەسە دەگەیەنێو ئەمەندە بەسە بۆ ڕەفزكردن، ئەگەر وانەبوایە خۆ دەتوانی لە دوو كەس بپرسیت ئەوجا وەڵامی ناوبراوت بدابایەتەوە.

## چۆن ئەحەمد شوکری شاعیر ناسراو بە دکتۆر شۆم ناسی

لە کۆتایی حەفتاکان چومە شاری بەغدادو هەندێك بابەتی ڕۆژنامەوانیم لەگەڵ خۆم برد بە مەبەستی بڵاوکردنەوەیان لە ڕۆژنامەی هاوکاری کە دەزگای هاوکاری بۆ چاپو بڵاوکردنەوەی کوردی دەریدەکرد. جا کە گەیشتمە بەغداد بۆ خەوتنو مانەوە چوومە هوتێلی هەولێر لە شەقامی ڕەشید. بەڕیوەبەری هوتێلەکە لە ژوورێکی دانام کە تەنها دوو تەختەی نووستنی تیا بوو، بە ووتەی ئەو یەکێك لەو تەختانە بۆ کەسێك حجز کراوە.

بەهۆی ماندووبوونم لە ڕێگاوە خۆم تەنها کردو لەسەر تەختەیەکیان لێی ڕاکشامو سەرخەوێکم شکاند. کاتێك کە بە خەبەر هاتمەوە ئێوارەبوو، بینیم کە پیاوێکی بە تەمەن لەسەر تەختەکەی تەنیشتم دانیشتووەو جانتایەکی گەورەی لە تەنیشت خۆی داناوە پڕ بوو لە ڕەشنووس. ئێوارە باشم لێی کردو ئەویش بەخێرهاتنی کردمو خۆی پێ ناساندمو ووتی من دکتۆر شۆم خۆشحاڵم بە دیدارت. منیش ووتم منیش کەمال سەعدیم شەرەفمەندم بە ناسینت. دوای ئەو یەکترناسینە کورتە، چاویلکەکەی لە چاو کردو خەریکی خوێندنەوەی ڕەشنووسەکانی ناو جانتاکەی بوو کە بریتی بوو لە کۆمەڵێك شیعری کلاسیکی بە کێشو سەرواو بە خەتی فارسی بە دەست نووسرابوونەوە. منیش ڕووم تێی کردوو ووتم مامۆستا ئەو هەموو شیعرە چی دەکەن لای تۆ؟ ئەوانە هی کێن؟ ووتی هەمووی هی منو بە دەستو پەنجەی خۆشم نووسراونەتەوە، بەیانی لەگەڵ خۆم دەیانبەم بۆ دەزگای هاوکاری بۆ بڵاوکردنەوەیان.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، بۆمن ئەو دیدارە زۆر گرینگ بوو، چونکە دەمێك بوو لە ڕووبەری ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان ناوی دکتۆر شۆم گوێ لێ بوو بوو، بەڵام لە نزیکەوە بە خزمەتی نەگەیشتبووم. سەبارەت بەو باولە پڕ لە شیعرەشی، دەگێڕنەوە مامۆستا کوڕێکی دەبێت زۆرجار دەیەوێ

لاسایی باوکی بکاتەوەو ببیّ بە شاعیرو بۆ ئەم مەبەستەش هەر جاریّك شیعر دادەنیّتو دەیداتە باوکی بۆ هەڵسەنگاندنی، کەچی باوکی بیّ ئەوەی بیخویّنیّتەوە فڕەی دەداتو دەڵیّ کەی ئەمە شیعرە، کوڕم ئەگەر دەتەویّ ببی بە شاعیر پیّویستە شیعری وەکو باوکت دابنیّی. جا بەپیّی ئەو ڕیوایەتە، ڕۆژیّك کوڕەکەی باولەکەی باوکی دەکاتەوەو شیعریّکی لیّ دەردەهیّنیّتو بە خەتی خۆی دووبارە دەینووسیّتەوەو پیشانی دەداتو دەڵیّ باوکە ئەم شیعرەم داناوە بزانە ئەوجارەیان چۆنە؟ مامۆستا دکتۆر شۆش وەکو جاران ئاسایی بە سەتحی تەماشای دەکاتو بیّ ئەوەی بیخویّنیّتەوە فڕەی دەدات دەڵیّ ئەمە کەی شیعرە. کوڕەکەشی لە قاقای پیّکەنین دەداتو دەڵیّ دەوەللاّ ئەوە شیعری تۆیەو لە جانتاکەت دەرم هیّناوە.

## منو ئەبوبەکر خۆشناو چوینە وەزارەتی ڕاگەیاندنی عێراقی

لـە کۆتـایی سـاڵی حـەفتاکان مـنو هـاوڕێی خوالێخۆشـبوو ئەبوبـەکر خۆشناو چوینە شاری بەغداد بۆ وەرگرتنی پاداشتی ئەو نووسینانەی کە لـەو ماوەیەدا لە ڕۆژنامەی هاوکاریو ڕۆشنبیری نـویێ بلاْومـان کردبـۆوە. ئەوکاتـە پاداشـتی بلاْوکردنــەوەی بابەتــەکان لــە دیــوانی وەزارەتــی ڕاگەیانــدن لــە سەرەتای گۆڕەپانی تەحریر لـەو شـەقامە بـوو کـە دەچـوو بـۆ شـۆڕیجە. لـە پرسـگە دوای ئـەوەی خۆمـان ناسـاند، بەرپرسـی پرسـگە پسـوولەی چـوونە ژوورەوەی داینیێ، لە هی من نووسرابوو کـەمال ئەلسـەعدیو لـە هـی ئـەویش نووسرابوو ئەبوبەکر خۆشابە، بەمە زۆر پێکـەنین بـەلاْم دەنگمـان نـەکردو تـا چەند ساڵێکیش کە یەکترمان دەبینیەوە بەو ناوانە بانگی یەکترمان دەکرد.

شـایەنی ئاماژەبۆکردنــە، ئــەو ڕۆژە ئێمــە زۆر دڵمــان خــۆش بــوو کــە پاداشتی بەروبوومی ئەدەبی خۆمان وەردەگرین، چـووینە ژووری ژمێریـاریو کچێکی بە ڕەگەز عەرەبمان لـە پـێش بـوو، ئـەویش بـۆ وەرگرتنـی پاداشـتی نووسینێکی هاتبوو کە لـە گۆڤـاری( الـف بـاو) بـلاْوی کردبـۆوە،بڕی شەسـت دیناری بە جارێك وەرگرت لە بـری بلاْوکردنـەوەی تـەنها بابـەتێك، کەچـی بـە مـنو ئەبوبـەکر خۆشـناو نیـوەی ئـەو بـڕە پارەیـەمان وەرگـرت لـە کاتێکـدا هەریەکی سیێ چوار بابەتمان بلاْو کردبۆوە. بەم دیمەنە زۆر خـەممان خـواردو هەستمان بە ناعەدالەتییێکی زۆر کرد، بەلاْم لە هـەناردەکردنو بلاْوکردنـەوەی بەرهەمە ئەدەبیەکانمان سارد نەبوینەوەو کۆڵمان نەدا.

## هەڵەیەك كە قەت لەبیری ناكەم

لــە هــاوینی ســاڵی ١٩٧٧ فەرمانبــەر بــووم لــە ئەمینــدارێتی گشــتی شــارەوانیو هاوینەهــەوارەكانو بــۆ مــاوەی ســێ مــانگ لــە بەڕێوەبــەرێتی هاوینەهەواری پیرمام تەنسیب بوومو ئەركی بەكرێدانی خانووەكانی گەشتو گوزاریم لەو هاوینەهەوارە پێ سپێردار.

شایەنی ووتنە، ئەوكاتە منهێشتان هاوسەرگیریم نەكردبوو، بــە فــەرمانی مامۆستا سیروان عەبدوللاَ جاف ئەمینداری گشتی خانوێكم بە تــەواوی كــەل‌و پەلەوە بــە خــۆڕایی پــێ درابــوو بــۆ خــۆم تیــای دەخــەوتم. هــەر ئــەو هاوینــە كەسێكیان بەناوی ئازاد زراری بە گرێبەست لەو پرسگەیە دامەزرانـد كـە مـن بەرپرسی بوو. ناوبراو قوتابی ئامادەیی بوو، باوكی نەمابوو، لەبـەر هــەژاریو نەداری بە برە پارەیەكی كەم بۆ بەسەربردنی پشووی هاوین دامەزرابوو.

ڕۆژێك ناوبراو داوای لێكردم كە ژوورێكی لەو خانووە بـدەمێ كـە بـۆ مـن تەرخانكرابوو بۆ ئەوەی تیای بخەوێ، ووتی ئەگەر لە هوتێل بخەوم هیچم بـۆ نامینێتەوە بۆیە زۆر سوپاست دەكەم ئەگەر لـەم ڕووە یارمــەتیم بـدەی. جـا ئەوەبوو لەبەر ئەوەی من ســەڵت بــوومو هــیچ پێویستیشــم بــەو ژوورە نــەبوو بۆیە ڕازی بووم كە لەگەڵ من لەناو ئەو خانووە بخەوێ. ئیتر بەو شـێوەیە تـا ماوەیەك وەكو برا بەیەكەوە دەخــەوتین، تــا مــانگی تــەمووز هــاتو داخــوازی لەســەر خانووەكــانی گەشــتیاری زۆر بــوو بــە چەشــنێك گەشــتیارێكی زۆری عەرەب كە لە ناوەڕاســتو باشــووری عێــراق دەهــاتن لەبــەر نــەبوونی جێگــای حەوانەوە، لەسەر شۆستەكان دەخەوتن. بۆیە مـن بـە خـەیاڵم داهـات ئەگـەر ئەو كوڕە دەربكەم لە خانووەكەم، دەتوانم چاكەی پێـوە بكـەمو نـاوە نـاوە بیدەمە خزمو كەسانمو ئەو كەسـانەی كـە زۆر پێویسـتیان بـە خـانوو دەبـێ. بۆیە ئێوارەیەك پێم ووت ئەمڕۆ دوا ڕۆژە كە لێرە بخەوی، بۆ خۆت شـوێنێكی تر بدۆزەوە. ئەویش ووتی جا كوێ بدۆزمەوە، خۆت دەزانی تەنها هـۆتێلم بـە

دەسـتەوە دەمینـێ، هـەروەکو خۆشـت دەزانـی ئەگـەر بچـمە هوتێـل هـیچ پارەیەکم بۆ نامینێتەوە. منیش ووتم ئەوە کێشەی خۆتەو من لێی بەرپرسیار نیم. ئەمەندەم ووتو چوومە ژوورەکەی خـۆمو لێـی خـەوتم، کاتێـك لـە نیـوە شەودا بۆ ئاوخواردنـەوە هەسـتامەوە، گـوێم لـە گریـانی کەسـێك بـوو لـە بـن تارمـەی خانووەکـە. کـە چـوومە دەرەوە بینـیم ئـازادەو چـاوەکانی بـە گـوڕ فرمێسکیان لێ دەڕژێ. بە دیتنی ئەم دیمەنە زۆر خەمبار بووم، هەر زوو زانیم هەڵەیەکی یەکجار گەورەم دەرحەق بەو کردووە، بۆیـە باوەشـم پیایـدا کـردو پەشـیمانی خـۆمم پێـی ڕاگـەیان بـۆ ئـەو کـارە خراپـەی کـە کردوومـەو لێـی پاڕامەوە کە لێم ببورێتو وەك برایەکی خـۆی قـەبولم بکاتـەوەو ئـەوجارەیان ئەو خاوەن خانووەکە بێتو من میوان.

شایەنی ئاماژەبۆکردنە، لەو ڕووداوەدا مـن دوو وانـەی گـرینگ فێربـووم، یەکەمیان کارکردنە بەو دوو ووتەیەی ئیمامی عـەلی کـوڕی ئـەبووتالیب ڕەزای خوای لێ بێت کە دەڵێ: (اذا دعتـك قـدرتك علـى ظلـم النـاس فتـذكر قـدرة الله عليك)، هەروەها (الدهر يومان، يوم لك ويوم عليك).

## سەرۆك وەزیرانی عێراق لێی دەدرێ

لە دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس کاتێك ئەمریکییەکان حکومەتی ئینتقالی پێك دەهێنن، ئەیاد عەلاوی دەکەنە سەرۆك وەزیرانی عێراق بۆ قۆناغی ئینتقالیو بارەگای حکومەتەکەشی لە ناوچەی سەوز دادەنێن. ئەو ناوچەیە بە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی ئەمریکییەکان ناسرابوو، لە کاتێکدا لە هەموو ناوچەکانی تری عێراقدا ڕۆژانە دەیان ئەمریکی لەلایەن هێزە چەکدارەکانی ڕووبەڕوو بوونەوەی هێزەکانی ئەمریکا دەبوونەوە، تەنها لەو ناوچەیە هەستیان بە ئارامی دەکرد، بۆیە چەندین خاڵی پشکنینی تۆکمەیان بە کەرەستەو تەکنەلۆژیای نوێوە لە دەوروبەری ئەو ناوچەیە دانابوو، کە هەموو خاڵەکانیش بە دەست سوپای ئەمریکاوە بوو. تەنانەت ئەندامانی ئەنجومەنی حوکمو دواتریش ئەندامانی ئەنجومەنی دارشتنی پڕۆژەی دەستوورو سەرۆکی حکومەتو وەزیرو بەرپرسەکانیش دەبوایە بەو خاڵانەی پشکنیندا بڕۆنو پابەندی ڕێنماییەکانیان بن.

یەکێك لەو کەسانەی کە لەسەر پشکی کورد ببووە ئەندام لە ئەنجومەنی دارشتنی پڕۆژەی دەستووری عێراق دکتۆر مونزیر فەزڵ بۆی گێڕامەوە ووتی ڕۆژێکیان ئەیاد عەلاوی سەرۆك وەزیرانی عێراق پێی ووتم وەرە بابەیەکەوە بچینە ئۆفیسەکەی منو قاوەیەك بەیەکەوە بخۆینەوە. جا ئەوەبوو منیش چوومەلای بەیەوەکەوە بەرەو بارەگای ئەنجومەنی وەزیران ڕۆیشتین. کە گەیشتینە پرسگەی ئەمریکییەکان، ئەفسەرێکی ئەو پرسگەیە ووتی جلو بەرگەکانتان دابکەنن تەنها فانیلەو شۆرت نەبێتو بە پێ خواسی بەناو ئامێری سۆنارەکەدا بڕۆن. ئەیاد عەلاوی بەم فەرمانە زۆر توڕەبوو، بە ئەفسەرەکەی ووت تۆ نازانی من کێم؟ من سەرۆك وەزیرانی عێراقمو خۆم داناکەنم. ئەفسەرەکەش ووتی منیش ڕێگات پێ نادەم بڕۆی. ئەیاد عەلاوی ویستی بەبێ ئیجازە تێپەڕێت، ئەفسەرەکە لێی هاتە پێشو هەتا هێزی

لەبەردابوو شەقازلەیەکی لە بن گوێی داو بەسەریدا هاواری کردوو ووتی لەسەر زك ڕابکشێ.من چوومە نێوانیانو ناسنامەی خۆمم بۆی دەرهێنا کە لەلایەن پنتاگۆنەوە دەرچوو بوو، ووتم من ڕاوێژکاری پنتاگۆنم ڕێگامان پێ بدە؟ بەڵام ئەم قسانە هیچ سوودێکی نەبوو، ئەفسەرەکە سوور بوو لەسەر فەرمانی خۆی تەنانەت ووتی دەبێ تۆش ئەم فەرمانە جێبەجێ بکەیتو خۆت دابکەنی.

دکتۆر مونزیر فەزڵ لە درێژەی قسەکانیدا ووتی من تەلەفۆنێکی سورەیام لەلابوو، پەیوەندیم بە حاکمی مەدەنی عێراق بریمەر کردوو داوام لێی کرد کە قسە لەگەڵ ئەو ئەفسەرە بکاتو پۆزش بۆ ئەیاد عەلاوی بهێنێتەوە. بەڵام بریمەر پشتگیری ئەفسەرە ئەمریکییەکەی کردو ووتی پێی دەڵێم سزاکەی لەسەر لابدات، بەڵام دەبێ ئێستاو لە داهاتووش گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەو بێت. ئیتر بەم شێوەیە منو ئەیاد عەلاوی جلی خۆمان داکەندو بە شۆرتو فانیلەوە چوینە ناو ئامێری سۆنارەکەوەو دواتر چووینە بارەگای ئەنجوومەنی وەزیران.

